# گێچەڵی سێکس

پاڵنەرەکانی - دەرهاویشتەکانی -
ستراتیژیەتی ڕووبەڕووبوونەوەی

د. ناصح مەلا کریم

ڕێنوێن
RENWEN



# گێچەڵی سێکس

پاڵنەرەکانی - دەرهاویشتەکانی -

ستراتیژیەتی ڕووبەڕووبوونەوەی

ناوی کتێب: گێچەڵی سێکسی
پاڵنەرەکانی - دەرهاویشتەکانی - ستراتیژیەتی ڕووبەڕووبوونەوەی
ناوی نووسەر: د. ناصح مەلا کریم
دیزاینی بەرگ: ناوەندی ڕێنوێن
دیزاینی تێکست: دانا حەسەن
نۆبەتی چاپ: یەکەم ٢٠٢٢
چاپ: ناوەندی ڕێنوێن
تیراژ: (١٠٠٠) دانە
ژمـارەی سـپاردن: لـە بەڕێوەبەرایەتیـی کتێبخانە گشـتییەکانی هەڵەبجە ژمارە (٣٠٢٥)ـــی ساڵی (٢٠٢٢)ـــی پێ دراوە.



RENWEN

**ناوەندی ڕێنوێن**

**07511408868 - 07501269689**

**hakem1423@yahoo.com**
**renwen2009@yahoo.com**

**سلێمانی - بازاڕی ناوباریک - نهۆمی یەکەم**
**بەرامبەر کاسۆمۆڵ - دوکانی ژمارە (٦٦)**

**پێشکەشە بە:**

هاوژینی سەنگین و گرانقەدرم (دایکی ڕاوێژ و ڕۆزین).

# پێڕست

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

# پێشەكی

سوپاس و ستاییشی بێسنوور بۆ پەروەردگاری جیهانیان، صەلات و سەلامی بەردەوام بۆ سەر پێغەمبەری خۆشەویست – دروودی خوای لەسەر بێت- وە بۆ سەر گشت یار و یاوەر و شوێنكەوتووانی تا رۆژی دوایی.

تێڕوانینی ئیسلام بۆ پاڵنەری سێكس (sex drive) و بابەتە پەیوەندیدارەكانی تێڕوانینێكی (ڕەسەن) و (واقیعی) و (هاوسەنگ) و (مامناوەند)ە، دوور لە ڕووكەشی و كەمتەرخەمی (تفریط)، وە دوور لە زێدەڕۆیی و پەڕگیری (الغلو والافراط). تێڕوانینێك هەڵقوڵای خوێندنەوەی دروستە بۆ سروشت و پێكهاتەی مرۆڤ، كە لە قورئانی پیرۆز و فەرموودەكانی پێغەمبەری ئیسلام (دروودی خوای لەسەر بێت) و بیرمەندانی كۆن و نوێی ئیسلامەوە سەرچاوە دەگرێت.

لەبەرامبەریشەوە، ئەمڕۆ سێكس بووەتە بابەتێكی مەترسیدار و وەك چەكێكی كوشندە بەكار دەهێنرێ لەلایەن هەندێ ناوەندی دەستڕۆشتووی جیهانی، لەژێر ناوی (ئازادی و ئازادیی سێكسی) و (هاوڕەگەزبازی)!

لێرەوە دەستبردن بۆ بابەتێکی هەستیاری وەک سێکس و لادانە سێکسییەکان -لەناویشیاندا گێچەڵی سێکسی- ئەرکێکی قورسە و لەوانەیە دۆستەکان پێش نەیار و ڕەقیبان تیری ڕەخنەیان ئاڕاستەمان بکەن!

لە خوێنەری ئازیز ناشارمەوە، لە سەرەتای ئەم نووسینەوە تا ڕادەیەک دوودڵ بووم؛ چوونکە زۆرێک لەو دۆستانەی ئەم ناوونیشانەیان دەبینی (گێچەڵی سێکسی) بەلایانەوە قورس بوو، دوان و قسەکردن دەربارەی بابەتێکی وا کە موسڵمانان و ئیسلامدۆستان لە نووسینەکانیاندا کەمترین بایەخیان پێ داوە. گومانیشم لەوەدا نییە ئەم کەمبایەخییەش پێچەوانەیە لەگەڵ دەقەکانی قورئان و سوننەت و ڕاڤەکاریی بیرمەندانی ئیسلام سەبارەت سێکس و بابەتە پەیوەندیدارەکانی.

هەروەها ئەم تێگەشتنە هەڵەیە بەرامبەر سێکس، یەک ناگرێتەوە لەگەڵ (فیقهی واقیع)، کە ئەم جۆرەی فیقهـ هیچی کەمتر نییە لە فیقهی زانستی و تیۆری.

غەزالی وەک بیرمەندێکی خاوەن ئەزموونی ئەم بوارە و لێکۆڵەرێکی ڕەفتارناسی، دەڵێت: (گەورەترین ئارەزوو لای مرۆڤ – پیاو- ئارەزووکردنی ئافرەتە، ئەم ئارەزووە زاڵترین و کاریگەرترین ئارەزووە بۆ سەر مرۆڤ لە کاتی هەڵچوون و خرۆشانیدا، هەروەها بەگوبەنگترین و سەرسەختترین ئارەزووە کە مرۆڤ لە ڕووبەڕووبوونەوەیدا دەستەوسان دەبێت). (الغزالی،٢٠٠٠: ٣/١٠٤)

پسپۆڕانی بواری پزیشکی و پزیشکیی دەروونی، دوای نزیکەی (دە) سەدە لە شیکارەکەی غەزالی، ڕاستییەکانیان دەربارەی سێکس ئاشکرا کردووە، لەم بارەرەیەوە پزیشکی دەروونی و

خاوەنی خەلاتی نۆبڵ (ئەلیکسیس کارێل) دەڵێت: (کاتێ ڕەمەک -غریزة-ی سێکسی لای مرۆڤ دەورووژێنرێت و دەجووڵێت، ئەوا جۆرە ماددەیەک دەر دەدا کە لە ڕێی خوێنەوە بەرەو دەماغ دەڕوات و بەنجی دەکات، بەم شێوەیە مرۆڤ ناتوانێت خاوەنی بیرکردنەوەیەکی ڕاست و دروست بێت). (کارێل: ١٩٨٣: ٦٧)

ئەمرۆ کە سەردەمی باڵادەستیی جیهانگیری و شۆڕشی زانیارییەکان و تەکنۆلۆژیایە لە لایەک و سەردەمی پەراوێزخستنی پەروەردەی ئیسلامی و بێبایەخکردنی بەها باڵاکانە لە لایەکی تر، لادانە سێکسییەکان ڕوو لە زیادبوونن و لەناویشیاندا گێچەڵی سێکسی، کە بەپێی ئامار و داتاکان بووەتە دیاردەیەکی مەترسیداری جیهانی - بە کۆمەڵگە موسڵمانەکانیشەوە.

گێچەڵی سێکسی وەک (ڕەفتارێکی سێکسئامێز) یەکێکە لەو دیاردە کۆمەڵایەتییە بێزراوانەی کە سەرجەم کۆمەڵگەکان -بێ هەڵاوێردن- بە شێوەیەکی ڕێژەیی بەدەستییەوە دەناڵێنن، چ لە شوێنی کار، یان ناوەندە زانستییەکان و ئەکادیمییەکان، یان لە بازاڕ و شوێنە گشتییەکان، تەنانەت -وەک حاڵەتێکی دەگمەن- هەندێ جار لەناو خێزانەکانیش ڕوو دەدات...!

ئەم دیاردەیە دادەنرێت بە ڕواڵەتێک لە ڕواڵەتەکانی (لادانی سێکسی) دەرەنجامی فاکتەرگەلێکی پەروەردەیی، کۆمەڵایەتی، سایکۆلۆژی، ئابووری.

ئامانجی ئەم لێکۆڵینەوەیە ئاشکراکردن و خستنەڕووی (چییەتی-ماهیەتی) سێکس و گێچەڵی سێکسییە، هەروەها پاڵنەر و دەرهاویشتەکانی، بەتایبەت دەرهاویشتە دەروونییەکانی. پاشان قسەکردن سەبارەت بە ستراتیژیەتی ڕووبەڕووبوونەوەی ئەم دیاردە مەترسیدار و نامۆیە.

لەم لێكۆڵینەوەیەدا هەوڵمان داوە شیكار ،و پەسن (وەسف) ی گێچەڵی سێكسی بكەین، بەو پێیەی دیاردەیەكی فرەڕەهەندە و ڕووبەڕووبوونەوەی دەبێت فرەلایەن بێت. لە كۆتاییشدا كۆمەڵێک پێشنیار و ڕاسپاردە خراونەتە ڕوو، بە مەبەستی ڕووبەڕووبوونەوەی دیاردەی گێچەڵی سێكسی و كەمكردنەوەی لێكەوتە و ئاسەوارەكانی لەسەر (گێچەڵكار) و (گێچەڵپێكراو) و خێزان و كۆمەڵگە و دەزگا و ئۆرگانەكان.

گرنگی و بایەخی ئەم لێكۆڵینەوەیە لەم چەند خاڵەدا خۆی دەبینێتەوە:

١. ئەم لێكۆڵینەوەیە لەسەر بابەتێک دەدوێت، كە كەمترین بایەخی پێ دراوە لە توێژینەوە و لێكۆڵینەوە ئیسلامییەكاندا، كە ئەویش بابەتی سێكسی و گێچەڵی سێكسییە.

٢. ئەم لێكۆڵینەوەیە هەوڵ دەدات لێكدانەوەیەكی ئەكادیمییانە بكات بۆ گێچەڵی سێكسی، لە ڕێی ڕاڤەكاری و لێكدانەوەی ئایینی و سۆسیۆلۆژی و سایكۆلۆژی و یاساییەوە.

٣. لەم لێكۆڵینەوەیەدا پشت بە توێژینەوە مەیدانییەكان و داتا و ئامارەكان بەستراوە، لە ئاستی ناوخۆ و دەرەوە.

٤. لەم لێكۆڵینەوەیەدا و لە ڕێی چاوپێكەوتنی ڕاستەوخۆی توێژەر لەگەڵ خەڵكانی پسپۆڕ، لێكدانەوە و شیكاریی زانستی بۆ دیاردەی گێچەڵی سێكسی كراوە، (ماهیەتی، پاڵنەرەكانی، لێكەوتەكانی، ستراتیژیەتی ڕووبەڕووبوونەوەی).

**ئامانجی توێژەریش لەم لێکۆڵینەوەیەدا بریتییە لە:**

١. ئاشنابوون بە چەمکی گێچەڵی سێکسی و چەمکە پەیوەندیدارەکانی.

٢. ناساندن و ئاشکراکردنی گرنگترین پاڵنەرەکان و کاریگەرترین لێکەوتەکان و ئاسەوارەکانی گێچەڵی سێکسی.

٣. پێشکەشکردن و خستنەڕووی ستراتیژێکی هەمەلایەنە و تۆکمە بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی گێچەڵی سێکسی، بەتایبەت لەم ڕۆژگارەدا، کە جومگەیەکی دەزگایی و ئۆرگانیی کۆمەڵگەیی و دەوڵەتی نییە کە گێچەڵی سێکسی پەلی بۆ نەهاوێشتبێت!

٤. دەرچوون لەو جۆرە بیرکردنەوە و شێوازە کلاسیکییەی نووسین و لێکۆڵینەوە، کە هەندێ لە موسڵمانان خوویان پێوەی گرتووە و دوورە لە ڕۆحی (پابەندبوون) و (ڕەسەنایەتی) و (واقیعیبوون) و (داهێنان)، کە ئەم خەسڵەتانە لە سیما دیارەکانی ڕێبازی ئیسلام و فیکری ئیسلامین، تا وای لێ هاتووە دونیاگەر و ماددەگەراکان -بەتایبەت بیری ڕۆژئاوایی و قوتابخانەی فرۆیدیزم لە دەروونناسیدا- خۆیان بکەنە دەمڕاست و کاریزما و بیرمەند و مونەززیری کۆمەڵگە و مەسەلە پەیوەندیدارەکانی بواری کۆمەڵایەتی، لەپێش هەمووشیانەوە سێکس.

**ئەوەی پێویستە لێرەدا بوترێ:** بە درێژایی مێژوو لادانە کۆمەڵایەتییەکان بوونیان هەبووە و بەردەوامیش لەگەڵ فراوانبوونی بازنەی مرۆڤایەتی و پەرەسەندنی کۆمەڵگە ڕوویان لە زیادبوون کردووە، لە بەرامبەریشەوە ئایینە ئاسمانییەکان یەکێک لە ئەرکەکانیان لەناو بردن و کەمکردنەوەی ئەو لادانانە بووە. لە سەردەمی ئەمڕۆشدا ئەم لادانانە لە هەڵکشاندان، بەتایبەت لادانە سێکسییەکان و بەتایبەتتریش (گێچەڵی سێکسی)، کە دەرەنجامی کۆمەڵێک فاکتەری

کەڵەکەبوو بووەتە دیاردەیەکی جیهانی. بۆ بەڵگەش لەسەر هەستیاریی بابەتی گێچەڵی سێکسی، لەم پیشەکییەدا چەند داتایەکی نێودەوڵەتی و ناوخۆیی دەخەینە ڕوو، کە ئاماژە بۆ بەجیهانیبوونی گێچەڵی سێکسی و ڕەهەندە نێودەوڵەتییەکەی دەدەن. ئیتر لێرەوە پێویست بەوە دەکات هەوڵەکان چڕ بکرێنەوە بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی گێچەڵی سێکسی. لێکۆڵینەوەکەی ئێمەش لەم ئاڕاستەیەوە کار لەسەر گرفتی گێچەڵی سێکسی دەکات.

بەپێی توێژینەوەیەک کە (لیژنەی پارێزگاری سیستەمی شایستەبوون) ئەنجامی داوە لە کۆمەڵگەی ئەمەریکی، دەر کەوتووە کە ٤٢٪ی ئافرەتانی ئەمەریکی لە شوێنی کارکردنیان و لە ٧١٪ی خوێندکارانی زانکۆ لە ئەمەریکا ڕووبەڕووی گێچەڵی سێکسی بوونەتەوە. هەمان توێژینەوە ئاشکرای کردووە کە لە هەرسێ سەربازی ڕەگەزی مێ لە سوپای ئەمەریکی، دووانیان ڕووبەڕووی گێچەڵی سێکسی بوونەتەوە. (Sever, p:188). لە کۆمەڵگەی کەنەدییش بەپێی ئەو توێژینەوەیەی لەسەر ١٢٠٠ ئافرەت ئەنجام دراوە، لە ٦١٪یان ڕایان گەیاندووە کە گێچەڵی سێکسییان بەرامبەر کراوە. لە هەمان وڵات کە گروپی (کتێبی سوور) ڕاپرسییەکی ئەنجام داوە کە ٩٠٠٠ ئافرەتی لەخۆ گرتووە، لە ٩١٪ی بەشداربووان ڕایان گەیاندووە کە گێچەڵی سێکسییان بەرامبەر ئەنجام دراوە. (Vincent. (Parrillo, 2002, p.193))

لەسەر ئاستی یەکێتیی ئەوروپاش: توێژینەوەکەی یەکێتیی ئەوروپایە کە لە ساڵی ٢٠٠٧ لەسەر ئاستی یەکێتیی ئەوروپا ئەنجام دراوە، لە ٤٥٪ی بەشداربووان ڕایان گەیاندووە کە ڕووبەڕووی گێچەڵی سێکسی بوونەتەوە. (مرکز المناصرة والارشاد القانوني، ٢٠١٠: ٩).

لەسەر ئاستی وڵاتانی موسڵماننشینیش، وڵاتی میسر بە پلەی یەکەم دێت؛ چەندین توێژینەوە ئاشکرایان کردووە کە ٩٧٪ی ژنان و کچانی میسری ڕووبەڕووی گێچەڵی سێکسی دەبنەوە. لە یەمەنیش ٨٧٪. (هيئة الامم المتحدة للمساواة بين الجنسين وتمكين المرأة بالاشتراک مع معهد التخطيط القومي – مصر،بلا: ١٦.)

لەسەر ئاستی کوردستانیش، بەپێی ڕاپرسییەکەی ڕێکخراوی Public Aid Organizationی نەرویجی – PAO- ٧٣٪ی کچان لە بازاڕ و لەناو حەرەمی زانکۆ و پەیمانگاکاندا ڕووبەڕووی گێچەڵی سێکسی بوونەتەوە، لەسەددا ١٣ی ئەنجامدەرانیش مامۆستایان و ئەندامانی ڕێکخراوە خوێندکاری و قوتابییەکان و کارمەندانی زانکۆ و پەیمانگاکانن.). (سایتی ڕێکخراوی فریاکەوتنی میللی PAO - سایتی خەندان: ٢٠١٧/١٢/٢٥).

لە کۆتاییدا ئومێد دەکەم خزمەتێکمان بە هاوزمان و هاونیشتمانیانمان کردبێت لە بواری ڕووبەڕووبوونەوەی لادانەکان، بەتایبەت لادانە پەروەردەییەکان و سێکسییەکان.

**هەڵەبجە**

**باخی میر**

**٢/ موحەڕڕەم/١٤٤٤**

**بەرامبەر ٢٨/ئاب/ ٢٠٢٢**



# دەستپێك

**(چیەتی - ماهیەت)ی سێکس:**

باسکردنی (سێکس) چ وەک ڕەمەک بێت یان پاڵنەر، بابەتێکی تا ڕادەیەک هەستیارە و تەنانەت باسکردنیشی لە (ڕوانگە ئیسلامییەکەوە) لای هەندێ نامۆیە و هەندێکیش بە کۆمەڵێ بەهانە و پاساو لە وەها باسێک خۆیان دەدزنەوە و لانی کەم خۆپارێزی هەڵدەبژێرن!

با ڕاشکاوانە بڵێین: لە تایبەتمەندییەکانی ئیسلام (واقیعیبوون) و (گشتگیری)یە؛ قسەکردنیش لەسەر سێکس و بابەتە پەیوەندیدارەکانی دەبێت لەم دوو چاوگەوە سەرچاوە بگرێت و دوور لە (ڕووکەشی) لە لایەک و (زیادەڕۆیی) لە لایەکی تر.

لێکدانەوە و شیکاریی جینس (سێکس) وەک چەمکێک لەو چەمکانەی قورئانی پیرۆز لە چوارچێوەی ئەدەب و حەیا و حیشمەتدا باسی لێوە کردووە، هەروەها وەک پێداویستییەکی بنەڕەتیی مرۆڤ، دەبێت لە چوارچێوەی ئەدەب و شەرم و بەهاکاندا بێت، نەک وەک هەندێ دەیانەوێ ئەم چەمکە بۆ مەرامی تێکدانی خێزان و کۆمەڵگە و بەرژەوەندیی خۆیان بەکار بهێنن و ڕەوایی پێ بدەن بە بیانووی (کرانەوە) و (ئازادی) و (ڕۆشنبیریی سێکسی)؟!

پاڵنەری سێکس دادەنرێت بە یەکێک لە پاڵنەرە بنەڕەتی و بنچینەییەکان و سەرچاوەی بەردەوامبوونی ژیانە و لە ڕێی ئەم پاڵنەرەوە وەچەکان دێنە بوون و کاروانی ژیان بەردەوام دەبێت. هەروەها لە ڕێی ئەم پاڵنەرەوە خێزان دروست دەبێت و لە کۆی خێزانەکانیش کۆمەڵگە پێک دێت و گەلان بە یەکتر ئاشنا دەبن و شارستانیەت پەرە دەسێنێت و زانست و پیشەسازی پێش دەکەوێت.

بەدڵنیاییەوە دەڵێین: پاڵنەری سێکس پێداویستییەکی حەتمییە و پێویستە بە شێوەیەکی زانستییانە ئاڕاستە بکرێت، وەگەر نا کاریگەریی ترسناکی لەسەر بەختەوەریی مرۆڤ و تەندروستیی جەستەیی و دەروونەدروستی دەبێت. لێرەوە بایەخدانی ئیسلام بە ڕێکخستن و کۆنترۆڵکردنی ئەم پاڵنەرە، هەڵقوڵاوی تیڕوانینی گشتگیری ئیسلامە بۆ مرۆڤ و ژیان و بوون و بوونەوەر؛ چوونکە ئیسلام هێڵی سووری نییە لەسەر باسکردنی ڕەمەکیی سێکس و بابەتە پەیوەندیدارەکانی، گوایە شتێکی قیزەونە و پێویستە خۆمانی لێ بپارێزین! —وەک ئەوەی لە ئایینە لادەر و دەستکاریکراوە ئاسمانییەکان دەیخوێنینەوە— هەروەها ئیسلام پاڵنەری سێکسیی نەخستووەتە بۆتەی ڕەهایی و ئیتر مرۆڤ ئازاد بێت چۆنی ویست ئەم پاڵنەرە بێ قەید و شەرت تێر بکات! —وەک ئەوەی لە وڵاتانی ڕۆژئاوا باوە— (عبدالکریم، ١٤٢٠هـ- ٢٠٠٠م: ٨١٣). بەڵکوو مامەڵەی ئیسلام لەگەڵ ئەم پاڵنەرە، مامەڵەیەکی ئیجابی و تەندروست و واقیعییە. بەڵگەش بۆ ئەم ڕاستییە چەندین ڕێنمایی ئیسلامییە سەبارەت بە تێرکردن و (تەوزیفکردنی) ڕەمەکیی سێکسی – وەک دواتر باسی لێوە دەکەین.

ئەوەی لێرەدا دەمانەوێ لەسەری بدوێین، قسەکردنە سەبارەت بە پاڵنەری سێکس لە ڕوانگەی قورئان و فەرموودە و دیدی زانایانی ئیسلام. دواتریش قسەمان دەبێت لەسەر ماهیەتی سێکس.

**یەکەم - قورئانی پیرۆز:** خوای گەورە لە چەند ئایەتێکی قورئانی پیرۆزدا ناڕاستەوخۆ ئاماژە بە پاڵنەری سێکس دەدات و ڕاشکاوانە ڕێگای تێرکردنی ئەم پاڵنەرە ڕوون دەکاتەوە، لە نموونەی ئەو ئایەتانەش:

١. ئایەتی ﴿هُوَ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ وَجَعَلَ مِنْهَا زَوْجَهَا لِيَسْكُنَ إِلَيْهَا فَلَمَّا تَغَشَّاهَا حَمَلَتْ حَمْلًا خَفِيفًا ﴿١٨٩﴾﴾. سورەتی الاعراف، ئایەتی ١٨٩.

واتە: خوای گەورە ئەو زاتەیە کە ئێوەی لە یەک نەفس و یەک شت دروست کردووەو هەر لەویش جووتەکەی بۆ بەدی هێناوە، بۆ ئەوەی ئارامی لەلا بگرێت، جا کاتێ پیاوەکە -مەبەست باوکە ئادەمە سەلامی خوای لەسەر بێت- چووە لای هاوسەرەکەی، ئەویش سکی پڕ بوو بە کۆرپەلەیەکی سووک...

٢. سەبارەت بە تێرکردنی پاڵنەری سێکس و ئەنجامدانی ئەرکێکی خێزانیی پێویست لە شەوانی ڕەمەزان کە -جیماعکردن-ە، خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿أُحِلَّ لَكُمْ لَيْلَةَ الصِّيَامِ الرَّفَثُ إِلَىٰ نِسَائِكُمْ﴾. (سورەتی البقرة: ١٨٧) واتە: لە شەوگاری ڕەمەزاندا کاری سەرجێیی -جیماعکردن- و تێکەڵبوونتان و جووتبوونتان لەگەڵ هاوسەرانتان بۆ حەلاڵ کراوە.

٣. دەربارەی خۆدوورگرتن لە هاوسەران لە ماوەی سووڕی مانگانە (حەیز – عادە) و پاشان تێکەڵاویکردنیان بە مەبەستی کاری سەرجێیی و –جیماعکردن– تێرکردنی پاڵنەری سێکس، خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الْمَحِيضِ قُلْ هُوَ أَذًى فَاعْتَزِلُوا النِّسَاءَ فِي الْمَحِيضِ وَلَا تَقْرَبُوهُنَّ حَتَّىٰ يَطْهُرْنَ فَإِذَا تَطَهَّرْنَ فَأْتُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ أَمَرَكُمُ اللَّهُ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ التَّوَّابِينَ وَيُحِبُّ الْمُتَطَهِّرِينَ

﴿ نِسَاؤُكُمْ حَرْثٌ لَكُمْ فَأْتُوا حَرْثَكُمْ أَنَّى شِئْتُمْ وَقَدِّمُوا لِأَنْفُسِكُمْ وَاتَّقُوا اللَّهَ وَاعْلَمُوا أَنَّكُمْ مُلَاقُوهُ وَبَشِّرِ الْمُؤْمِنِينَ ﴿٢٢٣﴾ ﴾ (سورەتی البقرة: ٢٢٢-٢٢٣).

واتە: ئەی پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێت- پرسیارت لێ دەکەن دەربارەی سووڕی مانگانەی ئافرەتان، پێیان بڵێ: ئەوە ئازار و زەرەرە، کەواتە خۆتان بەدوور بگرن لە هاوسەرەکانتان کە لەو حاڵەتەدا بن، نزیکیان مەکەون تا پاک دەبنەوە، جا کاتێک پاکوخاوێن بوونەوە و خۆیان شت، بچنە لایان بەو شێوەیەی خوای گەورە فەرمانی داوە، بەراستی خوا تەوبەکاران و پاکانی خۆش دەوێت. ژنانی هاوسەرتان کێڵگەن بۆتان و شوێنی چاندنی وەچەن، جا بە هەرشێوەیەک دەتانەوێ تۆو بوەشێننە ناو کێڵگەکەتانەوە -بە هیوای بەرهەم- و بۆ خۆتان دەستپێشخەری بکەن و لە خوا بترسن و خۆتان لەخراپە بپارێزن و چاک بزانن و دڵنیا بن کە بە دیداری خوا شاد دەبن و ئەم مژدەیەش بدە بە ئیمانداران.

٤. لە سورەتی (یوسف)یشدا کە پڕیەتی لە پەند و ئامۆژگاری و ڕێنمایی، خوای گەورە ئاماژەیەکی ڕوون دەدات بە پاڵنەری (سێکس) و هەژموونی ئەو پاڵنەرە کاتێ دێتە سەر باسی هاوسەری عەزیزی میسر، کە چۆن عەوداڵی یوسف پێغەمبەر -سەلامی خوای لەسەر بێت- بووە و هەوڵی لەخشتەبردنی دەدات و خۆی دەڕازێنێتەوە و دەرگاکان لە (یوسف)ی جوانڕوخسار و داوێنپاک دادەخات و ڕوو لە یوسف دەکات و دەڵێت: وەرە پێشەوە و خۆت ئامادە بکە، یوسفیش لە وەڵامدا دەفەرمووێ: پەنا بە خوا دەگرم و کاری وا ناکەم... تەنانەت پاش ئەوەی هاوسەری عەزیزی میسر -لە شاری میسر ئابڕووی چووە و ناوی زڕاوە- بەڵام هەر سوورە لەسەر بیرکردنەوە و ڕەفتارە

سێکسییە لادەرەکانی و لە بەرچاوی ژنان و ئافرەتانی میسر -دوای ئەوەی دەستی خۆیان بڕیوە لە ئەنجامی چاوتێبڕینیان لە جوانیی یوسف- دەڵێت: ئەوە ئەو کەسەیە کە ئێوە لۆمە و سەرزەنشتی منتان دەکرد لە بارییەوە، سوێند بێت بە خوا من ویستم لەخشتەی بەرم و فریوی بدەم، کەچی ئەو خۆی گرت و خۆی پاراست، سوێند بە خوا ئەوەی من داوای دەکەم و فەرمانی پێ دەکەم -کە داوێنپیسییە - نەیکات، ئەوە بەڕاستی زەلیل دەبێت و بە کەم تەماشا دەکرێت (تەماشای تەفسیری ئایەتەکانی ٢٣-٣٤ بکە لە سورەتی یوسف).

لێرەدا دەپرسین: حیکمەتی باسکردن و تۆمارکردنی ئەم بەسەرهاتەی یوسف و خێزانی عەزیزی میسر لە قورئانی پیرۆز بۆچی؟ مەگەر یەکێک لە حیکمەتەکان و پەندەکانی ئەم ڕووداوە، گرنگی و هاوکات مەترسیی پاڵنەری سێکس نییە، کە هەندێ جار مرۆڤ ئابڕووی خۆی دادەنێت لە پێناو تێرکردنیدا؟! بەتایبەت کە دەبینی ژنی پیاوێک کە پێگەیەکی حوکمڕانی و سیاسی و کۆمەڵایەتیی هەیە، کەوتووەتە داوی خۆشەویستی و ئەویندارییی کۆیلەیەک لە ماڵەکەیدا و ئەم ئافرەتە ئەویندارێکی وەهایە کە حەیا و شەرمی نەماوە!

٥. سەبارەت بە کاریگەریی خۆناسککردنەوە (نازکردن - مەکرکردن)ی ڕەگەزی مێ (جا هاوسەردار بێت یان بێهاوسەر) لەسەر ڕەگەزی نێر لە ڕەفتار و ڕۆشتن و ڕێکردندا و کاریگەریی ئەو نازکردنە لە وروژاندنی حەزی پیاوان، خوای گەورە ڕوو لە هاوسەرە پاکداوێنەکانی پێغەمبەری خودا -دروودی خوا لەسەر پێغەمبەر و ڕەزای خوا لە هاوسەرەکانی- دەکات و دەفەرموێ: ﴿يَا نِسَاءَ النَّبِيِّ لَسْتُنَّ كَأَحَدٍ مِنَ النِّسَاءِ إِنِ اتَّقَيْتُنَّ فَلَا تَخْضَعْنَ بِالْقَوْلِ فَيَطْمَعَ

الَّذِي فِي قَلْبِهِ مَرَضٌ وَقُلْنَ قَوْلًا مَعْرُوفًا ﴿٣٢﴾ سورەتی الاحزاب، ئایەتی ٣٢. واتە: ئەی ژنانی پێغەمبەر، ئێوە وەک هیچ ئافرەتێکی تر نین، ئەگەر بەتەواوی ترسی خوا لە دڵ و دەروونتان هەیە، قسە بە ناسکی و بە شێوەیەک مەکەن نەوەکوو ئەوەی دڵی نەخۆش بورووژێت و نیازی خراپ بکات. (محمد امین، ٢٠٠٢: ٤٢٢). چەندین توێژینەوەش ئەوەیان سەلماندووە کە مێشکی رەگەزی نێر (پیاو) مامەڵە دەکات لەگەڵ دەنگی مێینە بە شێوەیەکی جیاواز لە مامەڵەی لەگەڵ دەنگی نێرینە، بەتایبەت ئەگەر دەنگی ئافرەت کەمێک لەسەرخۆ و ناسک بێت.
(www.zyadda.com/what-happens-to-a-man-when-he-hears-the-voice-of-his-girlfriend)

**دووەم - سوننەت:**

بە گەڕانەوەمان بۆ سەردەمە پاکەکانی ئیسلام وەک سەردەمی پێغەمبەری خودا (دروودی خوای لەسەر بێت) و سەردەمی هاوەڵان و خولەفای راشیدین (خوا لێیان ڕازی بێت)، سەرباری ئەو پاکی و پاکیزەییەی هاوەڵانی پێ ناسراوە، بەڵام لەیادیان نەچووبوو کە داوای ڕوونکردنەوە بکەن لە پێغەمبەری ئیسلام لە زانست و زانیارییەکانی تایبەت بە سێکس کە جێی بایەخیان بوو، ڕوونترین بەڵگەش ئەم چەند فەرموودەیەیە:

١. بوخاری و موسلیم دەگێڕنەوە لە عەلیی کوڕی ئەبی تالیبەوە -خوای لێ ڕازی بێت- فەرمووی (مەزی)م هەبوو، شەرمیشم دەکرد ڕاستەوخۆ لە پێغەمبەری خوا بپرسم (بەو پێیەی فاتیمەی کچی پیغەمبەر هاوسەری پێشەوا عەلییە)، جا بە میقدادی کوڕی ئەسوەدم وت تا پرسیارم بۆ بکات، پێغەمبەری خوا فەرمووبوی

دەستنوێژ بگرێ. (البخاری، ۱۰۵/۱، باب غسل المذی والوضوء منه. ڕقم الحدیث ۱۳۲. ومسلم، صحیح مسلم ۲٤۷/۱، باب المذی، ڕقم الحدیث ۳۰۳.)

۲. ئەنەسی کوڕی مالیک دەڵێت: (ئوم سەلیم) هات بۆ لای پێغەمبەری خوا -دروودی خوای لەسەر بێت- لەو کاتەدا عائیشە لای پێغەمبەر بوو، ئوم سەلیم وتی: ئەی پێغەمبەری خوا! چۆن پیاو لە خەونا شەیتانی دەبێ، ژنیش ڕێک وەک ئەو شەیتانی دەبێ و ڕەحەت دەبێ، ئایا خۆشۆردنی لەسەرە یان نا؟ عائیشە وتی ئەی ئوم سەلیم، حەیای ژنانت برد وا و وات لێ بێ، پێغەمبەر بە عائیشەی فەرموو: بەڵکوو تۆ وا و وات لێ بێ، بەڵێ ئەی ئوم سەلیم، خۆشۆردنی لەسەرە ئەگەر ئەوەی بینی. (البخاری ۳۸/۱ باب الحیاء فی العلم، ڕقم الحدیث ۱۳۰. ومسلم ۲۵۱/۱، باب وجوب الغسل علی المرأة بخروج المنی منها، ڕقم الحدیث ۳۱۳)

۳. سەبارەت بە نزاکردن و پەناگرتن بە خوای گەورە لە شەیتان لە کاتی جووتبوون و ئەنجامدانی کاری سەرجێیی نێوان هاوسەران -جیماعکردن- پێغەمبەری خوا دەفەرمووێ: ئەگەر کەسێک لە ئێوە لە کاتی جووتبوون لەگەڵ هاوسەری، نزای کرد و وتی: بە ناوی خواوە، ئەی خوای بالادەست! بمانپارێزە، خۆمان و ئەوەی پێمان دەبەخشی لە شەیتان و شەیتانمان لێ دوور بخەرەوە، ئەوە ئەگەر خوا ویستی هەبێت لەسەر پێدانی منداڵ پێیان، شەیتان هیچ زیانێکی پێ ناگەیەنێت. (صحیح مسلم ۱۰۵۵/۲).

٤. زیاتر لەمانەش، پێغەمبەری خوا ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە -جیماعکردن- خێرە و وەک ماڵبەخشین وایە، وەک دەفەرمووێ: لە جووتبوونی ئێوە لەگەڵ (حەلالی خۆتان) هاوسەرەکانتان خێر

و چاكە هەيە، هاوەڵان ئەمەيان بەلاوە سەير بوو، بۆيە وتيان: ئەی پێغەمبەری خوا! ئایا کەسێک لە ئێمە کەیف لەگەڵ حەلاڵی خۆیدا بكا و ئارەزووی خۆی تێر بکات و لەگەڵ هاوسەری خۆی جووت ببێ، خێری دەگات و لای خوای گەورە پاداشتی هەیە؟ پێغەمبەری خوا فەرمووی: پێم بڵێن: ئایا ئەگەر لە ڕێی حەرام و داوێنپیسییەوە ئارەزووی خۆی تێر بکردایە، هیچ تاوانێکی لەسەرە یان نا؟ (بێگومان بەڵێ). بە هەمان شێوە مادام لە ڕێی حەلاڵەوە خۆی تێر کردووە و (سێکسی کردووە)، کەواتە خێری دەگات و خێری بۆ دەنووسرێ. صحيح مسلم ٦٩٧/٢.

٥. وەک ڕێگایەکی چارەسەری بۆ دەربازبوون لە مەترسییەکانی پاڵنەری سێکس و هەرجۆرە لادانێکی سێکسی، پێغەمبەری خوا ڕێنمایی نەوجەوانان دەکات و دەفەرمووێ: گەلی جەوانان! هەرکەستان تەوانایی سەرجێیی و ژنداری و هاوسەرگیریی هەیە، با ژن بهێنێ، چوونکە هاوسەرگرتن چاوی مرۆڤ تێر دەکا و داوێنی دەپارێزێ و دەبێ بە هۆی داوێنپاکی. ئەو کەسەیشی کە لە کێشیا نییە و توانای نییە هاوسەر بگرێ، با بەڕۆژوو بێ، چوونکە ڕۆژوو دەیخەسێنێ و دڵی دەمرێنێ. (البخاری ١٩٥٠/٥، باب قول النبی: من استطاع منكم الباءة فليتزوج فإنه أغض للبصر أحصن للفرج، رقم الحديث ١٨٠٦، ومسلم ١٠١٨/٢، باب استحباب النكاح لمن تاقت نفسه إليه وجد مؤنة واشتغال من عجز عن المؤن بالصوم، رقم الحديث ١٤٠٠.) لە فەرموودەکەی پێغەمبەری ئیسلام —دروودی خوای لەسەر بێت— ئاماژەیەکی زانستی بەدی دەکرێت بۆ ئەو بابەتەی دەروونناسان ناوی (تێرکارە جێگرەوەکان - **الإشباعات البديلة**)یان لێ ناوە. (حسين، ٢٠١٢: ٢٤).

**سێیەم - وتەی زانایانی ئیسلام:**

سەرجەم مەزهەبە فیقهییە ئیسلامییەکان بێ هەڵاوێردن، نووسراو و کتێبەکانیان خاڵی نییە لە بابەتە سێکسییەکان و ئەو ڕێنمایی و ئاڕاستانەی پەیوەندییان بە سێکسەوە هەیە، لێرەدا -وەک نموونە- ڕا و سەرنجی هەندێ لەو زانا موعتەبەرانە دەهێنینەوە دەربارەی پاڵنەری سێکس.

١- غەزالی (٥٠٥ک وەفاتی کردووە): دەربارەی کاتی گونجاو و خێردارتر بۆ -جیماعکردن- غەزالی دەڵێت: هەندێ لە زانایان پێیان باشە هاوسەران شەو و ڕۆژی هەینی -جیماع- ئەنجام بدەن. (غەزالی، ٢٠٠٠: ٢/ ٥٠). سەبارەت بە چێژوەرگرتنی پیاو پێش هاوسەرکەی و ڕەچاوکردنی باری دەروونیی هاوسەرەکەی تا ئەویش چێژی خۆی وەر بگرێت و سێکسی تێر بکات، غەزالی دەڵێت: هەرکات پیاو پێویستیی خۆی بەجێ هێنا و سێکسی تێر بوو، با چاوەڕێی ژنەکەی بکات تا ئەویش تێر دەبێت و دەگاتە چێژ و خۆشیوەرگرتن و سێکسی تێر دەبێت، چوونکە چێژوەرگرتنی ژنەکەی لەوانەیە دوا بکەوێ... دواتر غەزالی باس لە ماوەی -جیماعکردن- دەکات و دەڵێ: چاک وایە هەرچوار شەو جارێک، پیاو لەگەڵ هاوژینی خۆی -جیماع- بکات. (غەزالی، هەمان سەرچاوە و هەمان لاپەڕە).

٢- (نەوەوی ٦٧٦ک وەفاتی کردووە) دەڵێت: سوننەتە پیاو لەگەڵ هاوسەری خۆی یاری و دەستبازێ بکات و قسەی خۆشی لەگەڵ بکات بۆ هۆگری و کرانەوە و شەرمکردنەوەی -شەرمشکاندنی- هاوسەری، هەر وەک پێغەمبەری خودا بە (جابری کوڕی عەبدوڵڵای فەرمووو: بۆچی کچت نەخواستووە

تـا يـاری و دەسـتبازی لەگـەڵ يەكتـری بكـەن؟ (بوخـاری، ٥١/٤، مسـلم، ١٠٨٨/٢). (نـەوەوی) لەسـەر قسـەكانی بـەردەوام دەبێـت و دەڵێـت: ئاسـايیە -جيماعكـردن- ڕوو لـە قيبلـە يـان پشـت لـە قيبلـە، لـە دەشـت و بيابـان يـان لـە ماڵـەوە و لـە چوارچێـوەی خانـوو. (النـووی، ١٩٩١: ٢٠٧/٧).

٣- **(ئيبنولقەيـم ٧٥١ك وەفاتـی كـردووە):** زۆر بەڕوونـی بـاس لـە جيماعكـردن و كاتەكانـی جيماعكـردن و شـێوازەكان و جۆرەكانـی جيماعكـردن دەكات. (ابـن القيـم، ١٩٩٤: ٢٣١/٤). هەروەهـا دەڵێـت: ئـەوەی پێويسـتە پێش -جيماعكـردن- ئەنجـام بـدرێ: ياريكـردن و دەستبازی و ماچكردنی هاوسـەرە لەلايـەن مێردەكەيـەوە، هەروەها ليسـتنەوە و مژينـی زمانـی. (ابـن القيـم، ١٩٩٤: ٢٣١/٤).

بـەو چەنـد ئايـەت و فەرمـوودە و وتانـەی زانايـان كۆتايـی بـە تێڕوانينـی ئيسـلام بـۆ سـێكس و بابەتـە پەيوەنديدارەكانـی دەهێنيـن، خوێنـەر ڕێنمايـی دەكەيـن بگەڕێتـەوە بـۆ كتێبـە فيقهييـەكان و ئـەو بابەتانـەی دەربـارەی (نيكاح) و (زواج) نووسـراون لـە كتێبـە فيقهييەكان و ئـەوەی پێـی دەوتـرێ (آداب العشـرة والمعاشـرة).

### خۆشويستنی سێكسی و ئەويندارى و سۆز:

واتـە خۆشـويسـتنی خێزان و هاوژيـن هەروەهـا منـاڵ. لـە لێكۆڵينەوە پەروەردەيـی و دەروونييەكانـدا، ئـەم جـۆرەی خۆشـەويستی زياتـر لـە جۆرەكانـی تـری هەڵچوونـی خۆشـەويستی قسـەوباسـی لەسـەرە. خـوای گـەورەش بـە ويسـت و دانايـی خـۆی ئـەم جـۆرەی خۆشـەويسـتيی لـە مرۆڤـدا ئەفرانـدووە و هەريـەك لـە نێـر و مێـی جێگيـر كـردووە، بـە شـێوەيەك تـا ببێتـە مايـەی ڕاكێشـانی نێـر و مـێ بـۆ يەكتـری لـە پێنـاو مانـەوەی جـۆر و بـەردەوامیـی ژيـان.

ئایینی پیرۆزی ئیسلامیش وەک ئایینێکی خواکرد ڕێز لەم جۆرەی خۆشەویستی (خۆشەویستیی سێکسی) دەگرێت و ڕێنمایی پێویست و دروستیش بە هەردوو ڕەگەز دەدات بۆ (تەوزیفکردن) و تێرکردنی (خۆشەویستیی سێکسی) ئەویش لە تەنها ڕێگای دروستەوە کە (پرۆسەی هاسەرگیری)یە. ئەم هاوسەرگیرییەی نێوان هەردوو ڕەگەزیش تەنها چێژێکی سێکسی و تێرکردنی ئارەزوو نییە و بەس؛ بەڵکوو تێکەڵاوبوونی هەست و نەستەکان پێش بەیەکگەیشتنی جەستەکانە، ئەمەش تەنها لە ڕێی ئامادەباشیی دەروونییەوە دەبێت پێش کاری سەرجێیی و مومارەسەی سێکسیی شەرعی – جیماعکردن.

سەبارەت بە سێکس و خۆشەویستی، توێژەرێک بەراورد دەکات و دەڵێت:

- سێکس (لە حاڵەتی جیاکردنەوە و دابڕانی لە خۆشەویستی) تەنها کارێکی جەستەیی سنووردارە لە ڕووی کات و شوێن و چێژەوە. بەڵام خۆشەویستی هەستێکی گشتگیرە و بە قووڵاییەکانی ناخدا شۆڕ دەبێتەوە و سەرجەم بەشەکانی لاشە دەگرێتەوە.
- سێکس حاڵەتێکی کاتییە، کۆتایی دێت بە کۆتاییهاتنی ئارەزوو، بەڵام خۆشەویستی حاڵەتێکی بەردەوامە و پێش تێرکردنی ئارەزوو دەست پێ دەکات و دوای چێژوەرگرتن و تێرکردنی ئارەزوویش بەردەوام دەبێت.
- سێکس وەسیلە و کەرەستەیە، بەڵام خۆشەویستی ئامانج و مەبەستە.
- خۆشەویستی بەیەکگەیشتن و یەکگرتنی دوو کەسە بە هەموو سیفاتەکانیان؛ بەڵام سێکسی دابڕاو لە خۆشەویستی بەیەکگەیشتنی جەستەیەکی دیاریکراوە بە جەستەیەکی دیاریکراو.

- لە سایەی خۆشەویستیی ڕاستەقینەدا، سێکس زۆر لە وردەکارییەکان تێدەپەڕێنێت لە کاتی بوون و ئامادەیی خۆشەویستیدا، سپیبوونی مووەکان و چرچیی نێوچاوان و لەرزۆکیی دەستەکان کاریگەرییان نابێت. بەڵام لە کاتی نائامادەیی و ونبوونی خۆشەویستی، کێشە و گرفتە خێزانییەکان سەر هەڵدەدەن و پەرە دەسێنن و ڕوو لە زیادبوون دەکەن، چوونکە ژن و پیاو هەست بە ئاسوودەیی و بەختەوەری ناکەن. لەبەر ئەوەی سێکس باڵادەستە و خۆشەویستی ون بووە. (محمد المهدی، مقالة بعنوان: (الحب والجنس)، موقع اسلام أون لاین. لینکی بابەتەکە: (www.islamonline.)



# توێژبەندی یەکەم

## گێچەڵی سێکسی (چەمك و ماهیەت)

**چییەتی (ماهیەتی ) گێچەڵی سێکسی:**

توندوتیژیی سێکسی یەکێکە لە جۆرەکانی توندوتیژی کە بەرامبەر ڕەگەزی مێ ئەنجام دەدرێت و چەند ڕوویەکی هەیە، لەوانەش: گێچەڵی سێکسی کە بابەتی نووسینەکەی ئێمەیە. ئەم دیاردەیە کە ئەنجام دەدرێت دژی ڕەگەزی مێ (هەندێ جاریش دژی ڕەگەزی نێر بەتایبەت منداڵان) دیاردەیەکی فرەڕەهەندە و لە گۆشەنیگای شەرعناسان و یاساناسان و پسپۆڕانی بواری سایکۆلۆژی و سۆسیۆلۆژی پێناسە کراوە و ناسێنراوە، تا تاک و کۆمەڵ لە مەترسی و دەرهاویشتەکانی پارێزراو بن.

لەم توێژبەندەدا چەند پێناسەیەکی ئەم چەمکە (گێچەڵی سێکسی) کە چەمکێکی ئاوێتەیە -مرکب-ە دەخەینە ڕوو، دوای ناساندنی هەریەک لە (گێچەڵ) و (سێکس).

- **گێچەڵ**: وشەی گێچەڵ (التحرش - harassment) بە ماناکانی (بزواندن، وروژاندن، هەژاندن، خوراندن، فریودان، ڕێپێگرتن، یەخەگرتن، تەڵەبۆنانەوە) دێت. لەم بارەیەوە کەسی (گێچەڵکار)

هەوڵی فریودان و لەخشتەبردنی بەرامبەر (گێچەڵپێکراو) دەدات لە ڕێی کۆمەڵێ ڕەفتاری (سێکسئامێز) تا ببێتە نێچیری حەز و ئارەزووەکانی. (بڕوانە: الهروي، ٢٠٠١م: ١٠٨/٤. ابن الأثير، ١٣٩٩هـ - ١٩٧٩م: ٣٦٧/١. مصطفى واخرون، بلا: ١٦٦/١. نظام الدين،٢٠٠٣: ١٣٣).

- **سێکس -Sex-:** بریتییە لە کۆی پرۆسە فیزیۆلۆجی و سایکۆلۆجییە پەیوەندیدارەکانی وەچەخستنەوە و چێژوەرگرتن لە کاتی ئارەزووهەڵسان و ئارەزووکردنی هەریەک لە ڕەگەزی نێر و مێ بۆ یەکتری. (جابر و کفانی، ١٩٩٥: ٣٥٠٤/٩).
- **سێکس:** واتە نێرینەییبوون یان مێینەییبوون، هەروەها وشەی سێکس واتە ئەو ڕەمەک -غريزة-یەی کە یەکێک لە دوو ڕەگەزی نێر و مێ بۆ لای یەکتری ڕادەکێشێ. هەروەها بە مانای پەیوەندیی سێکسی و مومارەسەی سێکس دێت. (وەسفی سێکس)یش واتە وروژێنەری حەز و ڕەمەکیی سێکسی. (لطفی الشربینی، بلا: ١٦٩).

سێکسناسی (سێکسۆلۆجی - Sexology)ش، ئەو زانستەیە کە بایەخ بە کارلێککردنە ڕەفتاری و سایکۆلۆجی و جەستەییە پەیوەندیدارەکانی حەزی سێکسی و چالاکیی سێکسی دەدات (الحفني، ٢٠٠٢: ١٧).

**گێچەڵی سێکسی** (Sexual Harassment) **وەك چەمکێکی ئاوێتە:**

گێچەڵی سێکسی نامۆیە بە ئەدەبیانی ڕۆژهەلاتی بە گشتی و ئیسلامی بەتایبەتی، ئەم چەمکە ڕەگوریشەیەکی ڕۆژئاوایی هەیە، لە زمانی ئینگلیزیدا بە (sexuel harassemen) و لە زمانی فەرەنسییش بە (harcèlement sexuel) هاتووە. ئەم چەمکە

بەکار هاتووە بۆ خستەڕووی کرۆکی گێچەڵی سێکسی، کە مانای زۆرداری و ستەمکاریی لایەنێک دێت دژ بە لایەنێکی تر، وە گرتنەبەری کۆمەڵێک ڕەفتاری دیاریکراو، لەگەڵ ناهاوسەنگی و نابەرابەریی هەردوو لایەن و ناڕازیبوونی دووقۆڵی، هاوکات پێداگری و سووربوونی تاوانکار و کەتنچییەک -کە بێزراو و قەبوڵنەکراوە- بۆ بەدەستهێنانی سوود و قازانجێک کە مۆرکی سێکسیی پێوە دیارە. (مصطفی، ٢٠١٣: ١٢).

لەم توێژبەند -مبحث-ەدا هەوڵ دەدەین گێچەڵی سێکسی لە ڕەهەندە ئیسلامی و سۆسیۆلۆژی و سایکۆلۆژی و یاساییەکەیەوە بناسێنین و شیکاریی بکەین.

**یەکەم - گێچەڵی سێکسی لە ڕەهەندی ئیسلامییەوە:**

سەرباری ئەوەی چەمکی (گێچەڵی سێکسی) یەکێکە لەو چەمکە نوێیانەی کە نامۆیە بە کولتووری موسڵمانان و ئەدەبیاتی ئیسلامی و فەرهەنگە زمانەوانییەکان، وەک ئەوەی ئەمڕۆ ڕوو دەدات باسیان نەکردووە، بەڵام زانایان و بیرمەندانی ئیسلامی هاوچەرخ هەوڵیان داوە چەندین پێناسەی بۆ بکەن، لەوانە:

- پێناسەکەی (بن سعدون): (گێچەڵی سێکسی: بریتییە لە هەموو ئەو ڕەفتارانەی -کرداری و گوفتاری- کە لە کەسێکەوە سەرچاوە دەگرن و بەرامبەر کەسێکی تر ئەنجام دەدرێن، کە مانای ئارەزوو و هەوەس و حەزی سێکسی دەبەخشن و وروووژێنەرن و ئامانجیان ئەنجامدانی کاری سێکسیی حەرامە. کۆی ئەم ڕەفتارانەش (چ کرداری و چ گوفتاری) بە کاری ڕێپێنەدراو و سنووربەزاندن و تێپەڕاندنی ئایین و پێشێلکاریی ئاکار و ئادابی گشتی دادەنرێن. (عبدالمنعم، ١٤٣٢-١٤٣٣ هـ: ٣٠).

- پێناسەی (نەسرین عبدالحمید): (گێچەڵی سێکسی تاوانێکی ئاکاری -ئەخلاقی-یە، کە دەستبردنە بۆ لەشی ئافرەت بە شێوەیەک پێچەوانەی ئەو یاسا و ڕێکارە شەرعییانەیە کە دانراون بۆ پاراستن و پارێزگاریلێکردنی، لە تەماشاکردنێکی حەرامەوە تا دەستدرێژیی سێکسی و پەیوەندییەکی ئابڕووبەرانە. (طوالبة وهماجن، ٢٠١٣: ٤٣، نقلا عن: نسرين عبد الحميد نسيه،الإجرام الجنسي،دار الجامعة الجديدة،الإسكندرية- ٢٠٠٧: ١٥٨).

لە ئەنجامی شیکاریی پێناسەکانی گێچەڵی سێکسی لە ڕوانگە ئیسلامییەکەیەوە، ئەم ڕاستیانەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە:

١. **گێچەڵی سێکسی**: هەموو ڕەفتارێکی سێکسیئامێزی نادروست و ڕێگەپێنەدراو دەگرێتەوە، وەک: ئاماژە؛ ئاماژەی چاوەکان و پێکەنین و خەمزەکردن. قسە؛ وەک: نوکتەی سێکسی و وشەی دڵداری و هەر قسەیەک کە بۆنی سێکسی لێوە بێت. کردار؛ وەک: دەستبۆبردن و ماچکردن و خۆلێسوین. نووسین، وەک: نووسینی نامەی سێکسی و بابەتی سێکسی.

٢. **گێچەڵی سێکسی لە کەسێکەوە بەرامبەر کەسێکی تر ئەنجام دەدرێت**: کە ئەمەش هەردوو ڕەگەزی نێر و مێ دەگرێتەوە و مەرج نییە تەنها ڕەگەزی نێر گێچەڵ بە ڕەگەزی مێ بکەن، بەڵکوو -وەک لە چیرۆکی یوسف پێغەمبەر و هاوسەری عەزیز میسر دیارە و توێژینەوە مەیدانییەکانیش ئاشکرای دەکەن- هەندێ جار ڕەگەزی مێ گێچەڵی سێکسی بەرامبەر ڕەگەزی نێر ئەنجام دەدەن.

٣. **گێچەڵی سێکسی مانای حەزی سێکسی دەبەخشێت و نامانجی گێچەڵکار ئەنجامدانی کاری سێکسیی حەرامە**: ئەمەش مانای پێشەکییەکانی (زینا) و (لاقەکردن – اغتصاب) و نێربازی و

پانیی بەپانیی – یان پانۆکێ –السحاق– (کە لەنێوان ڕەگەزی مێ ئەنجام دەدریێ) دەگەیەنێت. جا ئیتر ئاماژەیەک بێت بە دەست، یان خەندەیەک، یان چاوداگرتن، یان قسەیەک، یان نووسینێک کە سێکسبەخش بێت، یان دەنگێگی حەرام بێت.

٤. **سنووربەزاندن و پێشێلکاریی تێپەڕاندنی ئایین:** کەواتە گێچەڵی سێکسی ڕەفتارێکی سێکسیی ڕێپێنەدراو و پێشێلکارییەکی ڕوونی هەموو ئەو ئادابە گشتییانەیە کە وەک چەپەر –سیاج– دانراون بۆ سەقامگیریی کۆمەڵ و ئاشتیی کۆمەڵایەتی. لە لایەکی ترەوە ئەوەی تێبینی دەکرێت هەندێ لەو ڕەفتارە سێکسئامێزانە لە کۆمەڵگە موسڵماننشینەکاندا کاری پەرگیری و قەدەغەکراو و حەرامن، تەنانەت هەندێ جار سزای ئەو ڕەفتارانە دەگاتە کوشتن وەک نێربازی. بە پێچەوانەوە، ئەو ڕەفتارانە لە وڵاتانی ڕۆژئاوا و ناموسڵمان بە یاسا ڕێک دەخرێن، وەک نێربازی و هاوڕەگەزی و تەنانەت سێکسکردن لەگەڵ ئاژەڵانیش.

**دووەم - گێچەڵی سێکسی لە ڕەهەندی سایکۆلۆژییەوە:** بۆ دیاریکردن وناساندنی گێچەڵی سێکسی لە ڕووی سایکۆلۆژییەوە، توێژەرانی ئەم بوارە هەوڵیان داوە لە دەرهاویشتە و دەرەنجامە دەروونییەکانی گێچەڵی سێکسی بڕوانن و دواتریش لەژێر کاریگەرییە دەروونییەکانی گێچەڵی سێکسی –وەک دیوێکی لادانی سێکسی- گێچەڵ بناسێنن.

لەو توێژینەوانەش لە ڕوانگەی سایکۆلۆژییەوە شیکاریی گێچەڵی سێکسی دەکەن، توێژینەوەکانی هەریەک لە ڤان ویجیک (Van Wijek،2009) و ئیزیس (Isis،2011)، کە بەڕوونی و پاش

لێکۆڵینەوەی ورد لە چەند حاڵەتێکی مەیدانی لەسەر قوربانییانی گێچەڵی سێکسی، باسیان لە کاریگەرییەکانی گێچەڵی سێکسی کردووە و ناساندوویانە، بەتایبەت کاریگەرییەکانی لەسەر دەروونددروستی و ژیریدروستی و لەشساغی.

(ئیزیس) پێی وایە پەیوەندییەکی پتەو هەیە لەنێوان گێچەڵی سێکسی و هەندێ گۆڕانکاریی دەروونیی نەرێنی –سلبی- لەوانە: دڵەڕاوکێ، خەمۆکی، دابەزینی ورە، ترسی لەڕادەبەدەر، لۆمەی خودی. لەبەر ئەمانە (ئیزیس) لە کلاورۆژنەیەکی سایکۆلۆژییەوە گێچەڵی سێکسی بەم شێوەیە دەناسێنێ: (گێچەڵی سێکسی، ڕەفتارێکی بێزراو و قێزەونە کە زیاتر لە گێچەڵی مەعنەوییەوە نزیکە و کۆمەڵێ وشە و کرداری سێکسیئامێز لەخۆ دەگرێت، هەندێ جاریش فریودان یان هەڕەشەکردن، بە مەبەستی دروستکردنی پەیوەندییەکی سێکسی لەگەڵ بەرامبەر). (: 292011 ،Isis). هەروەها توێژەر و پسپۆڕی بواری سایکۆلۆژی مارسیلیا هێرتا (Mariselela Huerta) هەوڵی داوە لە ڕێی پەیوەندیی نێوان چەمکی گێچەڵی سێکسی و شۆکی دەروونییەوە (psychological trauma) پێناسەی گێچەڵی سێکسی بکات. ئەو پێی وایە گێچەڵی سێکسی: (کارێکی سێکسییە کە دەبێتە مایەی دڵەڕاوکێ و خەمۆکی و دابەزینی متمانە بە خۆت، ئاستەنگی وەبیرهاتنەوە و نەمانی ڕێزگرتنی خود و لەباربردنی لەشساغی). (Mariselela Huerta,2006:32)... وەک دەبینین ئاراستەی دەروونی لای هەندێ لە دەروونناسان بۆ گێچەڵی سێکسی جەخت دەکاتەوە لە دەرهاویشتە و کاریگەرییە دەروونی و جەستەیی و ژیرییەکانی گێچەڵی سێکسی.

**سێیەم: گێچەڵی سێکسی لە ڕەهەندی سۆسیۆلۆژی (کۆمەڵناسی)یەوە:**

شارەزایان و پسپۆڕانی بواری سۆسیۆلۆژی (کۆمەڵناسی) چەندین توێژینەوەی مەیدانییان ئەنجام داوە سەبارەت بە دیاردەی گێچەڵی سێکسی و پاڵنەرەکانی، هەر لەم ڕوانگەیەوە هەوڵیان داوە شیکارییەکی سۆسیۆلۆژی بۆ گێچەڵی سێکسی بکەن و پێناسەی بکەن.

لەو توێژینەوانەش لەم بارەیەوە ئەنجام دراون: توێژینەوەکەی (لیۆرا ڕیسی Reese) و (کارین لیندینبێرگ Landenberg) کە هەوڵیان داوە پەیوەندییەک بدۆزنەوە لەنێوان چەمکی (جێندەر) و (گێچەڵی سێکسی)، لەبەر ئەمە ئەو دوو توێژەرە پێناسەی گێچەڵی سێکسی دەکەن بەوەی کە: **(چالاکییەک و ڕەفتارێکی قێزەون و بێزراوە، کە سەرنجدانی جەستەیی و داواکاری و تەنگپێهەڵچنینی سێکسیی هەڕەشەئامێز لەخۆ دەگرێت).**

(Laura A. Reese and Karen E. Lindenberg 336-337;2005)

**چوارەم - گێچەڵی سێکسی لە ڕەهەندی یاساییەوە:**

بەو پێیەی گێچەڵی سێکسی ڕوویەکی لادانی کۆمەڵایەتییە و دەرهاویشتەکانی زیان بە تاک و کۆمەڵ دەگەیەنن و مەترسییەکانی هاوتای مەترسییەکانی گەندەڵی و دزی و ناپاکییە، یاسای سزدانی هەندێ لە وڵاتان گێچەڵی سێکسییان ناساندووە و سزاکەشیان دیاری کردووە، لەوانە، یاسای سزادانی میسری، یاسای سزادنی لوبنانی، یاسای سزادانی ئەمەریکی، یاسای سزادانی جەزائیری، کە ئەمەی کۆتاییان پێناسەی گێچەڵی سێکسی دەکات بەوەی کە: **(کارێکی ئامانجدارە، کەسێکی**

هەوەسباز پێی هەڵدەستێت بۆ مەرامێکی سێکسی، لە ڕێی خراپبەکارهێنانی دەسەڵات یان پۆست یان پیشە، بە دەرکردنی فەرمان بۆ کەسێ بەرامبەر، بە ترساندن، یان ناچارکردن، یان هەڕەشەلێکرن، یان فشارخستنەسەری، بۆ ئەنجامدانی کاری سێکسی ئابڕووبەر). (اعراب،٢٠٠٩:٤٤٥). بەلام لە یاسای سزادانی هەرێم و عێراق -کە زۆرێک لە یاساکانیان درێژکراوەی یاسای سزادانی ڕژێمی بەعسن- شتێک نییە بە ناوی گێچەڵی سێکسی وەک چەمک، هەرچەندە لە برگەکانی ماددەکانی ٣٩٣-٤٠٤ بەوردی باس لە هەندێ ڕەفتاری سێکسیی نادروست دەکات وەک نێربازی، لاقەکردن – اغتصاب، زیناکردن، ئەتکی نامووس، کردنەوەی پەردەی کچێنی، وتنی هەندێ وشەی سێکسیئامێز و فریودەر، کە زۆربەیان لەژێر ڕەفتاری گێچەڵی سێکسی جێیان دەبێتەوە. هەروەها ماددە ئاماژەپێدراوەکان، سزای ئەنجامدەرانی ئەو تاوانە سێکسییانەیان دیاری کردووە و هەندێ جار دەگاتە زیندانی هەتاهەتایی و لەسێدارەدان، بەتایبەت ئەگەر ئەنجامدەری یەکێک لەو تاوانە سێکسییانە کارمەندی حکومەت بوو و دەسەلاتی خۆی خراپ بەکار دەهێنا بۆ ئەو ئامانجە سێکسییە لادەرانە. (قانون العقوبات: ٢٢).

پسپۆڕێکی یاساییش پێی وایە گێچەڵی سێکسی لە تاوانە شەرمئاوەرەکان (الفعل الفاضح المخل بالحياء)ە و واتە: هەر وتە و کردار و ئاماژە و دەربڕینێکی ناشەرمانە و بێئابڕووانە لە ڕێی وێنە و فیلم و گۆرانییەوە.(علی: چاوپێکەوتن: ٢٠١٩/٢/٢٥).

ئەوەی جێی سەرنجە، پێناسە یاساییەکان گێچەڵی سێکسی دەناسێنن بەو پێیەی لادانە لە یاسا و سەرپێچیکردنیەتی و ڕەفتارێکە ئەنجامدەری ڕووبەڕووی سزا دەکاتەوە.

### چەند چەمکێکی هاوواتای (گێچەڵی سێکسی):

وەک پێشتر ئاماژەمان پێ دا، ئەگەرچی (گێچەڵی سێکسی) وەک چەمک و دەستەواژە نامۆیە بە کولتووری موسڵمانان، بەڵام چەند چەمکێکی هاوواتای لە سەرچاوە ئیسلامییەکاندا (قورئانی پیرۆز، فەرموودە، کتێبە فیقهییەکان و کتێبە پەروەردەییەکان)دا هاتووە، لەوانە:

- **لەخشتەبردن و تەماحتێکردن (المراودة)**: واتە: فێڵلێکردن، جووتبوون لەگەڵی (بڕوانە: ابن منظور، بلا: ۱۹۱/۳. الفيومي، بلا: ۲٤٥/۱. إبراهيم مصطفى و اخرون، ۳۸۱/۱). لە قورئانی پیرۆزیشدا خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَرَاوَدَتْهُ الَّتِي هُوَ فِي بَيْتِهَا عَنْ نَفْسِهِ وَغَلَّقَتِ الْأَبْوَابَ وَقَالَتْ هَيْتَ لَكَ قَالَ مَعَاذَ اللَّهِ إِنَّهُ رَبِّي أَحْسَنَ مَثْوَايَ إِنَّهُ لَا يُفْلِحُ الظَّالِمُونَ﴾. (سورەتی یوسف: ئایەتی ۲۳). واتە: جا ئەو ئافرەتەی کە یوسف لە ماڵیا بوو هەوڵێکی زۆری لەگەڵ دا، هەتا یوسف لەخشتە ببات و دڵی ڕابکێشێت بۆ لای خۆی، ڕامی بکا و لەگەڵیا جووت ببێ! (محمد امین، تاران: ۲۳۸. کاکە محمود، ۲۳۸).
- **شەیدابوون (الشغف)**: واتە: پەرۆشی، سۆزی بەتین، ئەوینداری. وەک خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَقَالَ نِسْوَةٌ فِي الْمَدِينَةِ امْرَأَتُ الْعَزِيزِ تُرَاوِدُ فَتَاهَا عَنْ نَفْسِهِ قَدْ شَغَفَهَا حُبًّا إِنَّا لَنَرَاهَا فِي ضَلَالٍ مُبِينٍ﴾ سورەتی یوسف: ئایەتی ۳۰. واتە: کۆمەڵێک لە ژنە ناودارەکانی میسر قاویان داخست و وتیان: سەیرە! ژنەکەی (عەزیز) خەریکی دڵداری و ڕامکردنی غوڵامەکەی خۆیەتی و حەزی لێ دەکا! بە شێوەیەک ئەوین و خۆشەویستی چووەتە ناو پەردەی دڵیەوە و شەیدای بووە و ئۆقرەی لێ بڕیوە، بەڕاستی ئێمە لە سەرگەردانییەکی ئاشکرادا دەیبینین، چوونکە نەدەبوو

ئەو لەگەڵ خزمەتکارێکی خۆیدا کاری وا بکات. (کاکە مەحموود، سەرچاوەی پێشوو: ٢٣٨).

- **ئەتککردن:** واتە نامووسشکاندن، ناوزڕاندن، ئابڕووبردنی ئافرەتێکی پاکداوێن و لەکەدارکردنی شەرەفی، چ بە بوختانبۆکردن بێت یان تۆمەتدانەپاڵ بێت. بەم پێیەیش گێچەڵی سێکسی یەکێکە لە تاوانە شەرمئاوەرەکان (الفعل الفاضح المخل بالحياء). خوای گەورەش لەم بارەیەوە فەرموویەتی: ﴿وَالَّذِينَ يَرْمُونَ الْمُحْصَنَاتِ ثُمَّ لَمْ يَأْتُوا بِأَرْبَعَةِ شُهَدَاءَ فَاجْلِدُوهُمْ ثَمَانِينَ جَلْدَةً وَلَا تَقْبَلُوا لَهُمْ شَهَادَةً أَبَدًا وَأُولَئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ﴾. سورەتی النور: ئایەتی ٤. واتە: (ئەوانەی کە بوختان دەکەن بۆ ئافرەتانی داوێنپاک و خاوەن مێرد، پاشان ناتوانن چوار کەسیش بە شایەت بهێنن، ئەوانە هەشتا قامچییان لێ بدەن و هەرگیز شایەتییان لێ وەر مەگرن، ئەوانە لە ڕیزی تاوانبار و لەسنووردەرچوو و یاخییەکاندان. (ئەمین، سەرچاوەی پێشوو. ٣٥٠). هەروەها دەفەرمووێ: ﴿وَالَّذِينَ يُؤْذُونَ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ بِغَيْرِ مَا اكْتَسَبُوا فَقَدِ احْتَمَلُوا بُهْتَانًا وَإِثْمًا مُبِينًا﴾ سورەتی الأحزاب: ٥٨ واتە: (هەروەها ئەو کەسانەیش کە ئازاری پیاو و ئافرەتە ئیماندارەکان دەدەن، بەوەی کاری ناشیرین و خراپەی وایان دەدەنە پاڵ کە هەرگیز ئەوان شتی وایان نەکردووە، بەڕاستی ئەوانە درۆ و بوختان و گوناهێکی گەورە و ئاشکرایان لە خۆیان بار کردووە و سزاکەی دەچێژن (گەلاڵی: ٤٢٦). لە ڕوانگەی یاساییشەوە ئەم تاوانە بە تاوانە شەرمئاوەرەکان (الفعل الفاضح المخل بالحياء) ناسراوە و یاسای سزادانی عێراقی سزای قورسی بۆ داناوە. (محمد: چاوپێکەوتن: ٢٠١٩/٢/٢٥).

- **لاقەکـردن:** لادانێکی سێکسـییە، ئامانجـی دەسـتدرێژیی سێکسـی و ناچارکردنی ئافرەتە (کچ یان ژن) بە زیناکردن و کاری ئابڕووبەر. (الحفنی: سەرچاوەی پێشوو: ٧٧٠).

- **زیناکردن:** وەک خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿وَلَا تَقْرَبُوا الزِّنَا إِنَّهُ كَانَ فَاحِشَةً وَسَاءَ سَبِيلًا﴾. سورەتی الإسراء: ئایەتی ٣٢. واتە: ئەی خەڵکینە! لە زینا و شەروالپیسی دوور بن، وە بە هیچ شێوەیەک توخنی زینا و شەروالپیسی و ئەوانەیش پێشەکین بۆی، وەک ماچومۆچ و قسە و... هتد مەکەون، چوونکە بەڕاستی زینا و داوێنپیسی تاوان و کردەوەیەکی زۆر خراپ و ڕێگایەکی زۆر ناپەسەندە (کاکە مەحمود: ٢٨٥).

- **دۆستگرتن:** وەک خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿فَانْكِحُوهُنَّ بِإِذْنِ أَهْلِهِنَّ وَآتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ مُحْصَنَاتٍ غَيْرَ مُسَافِحَاتٍ وَلَا مُتَّخِذَاتِ أَخْدَانٍ﴾. سورەتی النساء: ئایەتی ٢٥. واتە: لەبەر ئەوە ئەو کەنیزەکانە مارە بکەن لەسەر ڕەزامەندیی کەسوکار و خاوەنەکانیان و مارەییان بەچاکی پێ بدەن، لە کاتێکدا ئەو کەنیزەکانەش پێویستە پاکداوێن بن و دوور بن لە داوێنپیسی و دۆستگرتنەوە (محمد امین: ٨٢).

## پۆلێنی گێچەڵی سێکسی:

بە سەرنجدان و وردبوونەوە لەو لێکۆڵینەوە و توێژینەوانەی دەربارەی گێچەڵی سێکسی ئەنجام دراون، دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە ئەم ڕەفتارە بۆ چەند جۆرێک دابەش دەبێت، ئەم دابەشبوونەش لە

لايەک پەيوەنديی بە ئەنجامدەری گێچەڵەکەوە هەيە (نێر، مێ، خزم، بەرپرس، هەرزەکار، نەوجەوان، گەنج)، لە لايەکی ترەوە پەيوەنديی بە شوێنی ئەنجامدانی گێچەڵەکەوە هەيە (شوێنی کار، شوێنە گشتييەکان، ماڵەوە)، دواجاريش جۆری گێچەڵەکە (زارەکی، نازارەکی، جەستەيی).

دەرەنجامی توێژينەوەکانيان، پسپۆڕانی سايکۆلۆژی و سۆسيۆلۆژی و پەروەردەيی، هەوڵيان داوە چەندين پۆلێن بۆ گێچەڵی سێکسی بکەن، بەڵام ئەوەی زياتر کۆدەنگيی لەسەرە و لێکۆڵينەوەکان و توێژينەوە مەيدانييەکان ئاماژەيان پێ داوە، دابەشکردنی گێچەڵی سێکسييە بۆ هەرسێ جۆری (زارەکی، نازارەکی، جەستەيی) (عبادة: ١٩. الفار: ٢٠١٦: ٧٢٠).

**جۆری يەکەم - گێچەڵی سێکسيی زارەکی:** ئەم جۆرەی گێچەڵ هەموو ئەو ڕەفتارە زارەکييە سێکسئامێز و شەڕەنگێزانە دەگرێتەوە کە ڕاستەوخۆ يان ناڕاستەوخۆ کەسی گێچەڵباز –گێچەڵکار– بەرامبەر قوربانييەکە –گێچەڵپێکراو– ئەنجامی دەدات و ئامانجی فريودان و لەخشتەبردن و هەڵخەڵەتاندنی نێچيرەکەيە، بە مەبەستی دەستکەوتێکی سێکسی و گەيشتن بە مەرامێکی سێکسی. (بڕوانە: عاشور وغيره، ٢٠٠٨:١٩–٢٠. ايمان، ٢٠١٦: ٢٢).

لە نموونەی گێچەڵی سێکسيی زارەکی: قسەی دڵداری و وشەی نەشياو، توانج، نوکتە و پياهەڵدانی سێکسئامێز، گاڵتەوگەپ، ناردنی پەيامی زارەکيی ئابڕووبەر، پەيوەنديی تەلەفونی و ڤيديۆيی، داواکردنی پەيوەنديی سێکسيی نامەشروع، دەربڕينی سەرسامبوون بە بەژنوباڵا و جلوبەرگ و ڕوخساری ڕەگەزی مێ، زۆرلێکردن بۆ ژوانگە و دانانی کاتێک بۆ پەيوەندی و ئاخافتن، ناردنی نامە لە ڕێی ئيمەيڵ و smsەوە و... هتد... (زکی وفايد، ٢٠١٥: ٤٩–٥٠).

**جـۆری دووەم - گێچەڵـی سێکسـیی نازارەکـی:** لـە گرنگتریـن جۆرەکانـی ئـەم پۆلێنـە:
نـاردن و نمایيشـكردنی وێنـە و فیلمـی سێکسـی، پۆسـتەرات، سـنووربەزاندن ونزیکبوونـەوە لـە کەسـی قوربانـی، چاوداگرتـن، پەلامـاردان، چاوتێبڕیـن و تێرامـان، سـەرنجدانی شـوێنێکی تایبەتـی گێچەڵپێکراو وەک سنگ و مل، ناردنی دیاریی سێکسیئامێز، بەتایبەت وێنـەی ئابڕووبـەر و نەشـیاو، شـوێنکەوتنی گێچەڵپێکراو، داواکـردن و ناچارکردنـی گێچەڵپێکـراو بـە ناردنـی وێنـەی ڕووتـی خـۆی یـان دەرخسـتنی هەنـدێ شـوێنی هەسـتیاری لـەش... هتـد.
(العبـد المنعـم،١٤٣٢-١٤٣٣: ٦٣-٦٥. فایـد و زکـی،٢٠١٥: ٥٧-٥٩. مصطفـی، ٢٠١٣: ٢٢-٢٣.).

**جـۆری سـێیەم - گێچەڵـی سێکسـیی جەسـتەیی:** ئـەم جـۆرەی گێچـەڵ دەسـت پـێ دەکات بـە دەسـتلێدان و دەسـتبۆبردن و هەوڵـدان بـۆ لەئامێزگرتـن و ماچکـردن و نوقورچلێگرتـن و گازلێگرتـن، وە بـە لاقەکـردن و دەسـتدرێژیی سێکسـی بـۆ سـەر کەسـی گێچەڵپێکـراو کۆتایی دێت. (الخالدی، ٢٠١٨: ١٧٢-١٧٣. وئام وأسماء،٢٠١٥:٥٠-٥٢. عبادة،بـلا: ٢٤).



## توێژبەندی دووەم

# ئاراستە شیکاری و ڕاڤەکارییەکانی گێچەڵی سێکسی و پاڵنەرەکانی

### باسی یەکەم - ئاراستە ڕاڤەکارییەکانی گێچەڵی سێکسی:

گێچەڵی سێکسی ڕوویەکی لادانی کۆمەڵایەتییە، بەو پێیەی لادانی کۆمەڵایەتی هەرجۆرە ڕەفتارێکە کە ناگونجێت و یەک ناگرێتەوە لەگەڵ ئەو بەها و پێوەر و دابونەریتە کۆمەڵایەتییانەی کۆمەڵگەی لەسەر ڕاوەستاوە و ڕەفتاری تاکەکانی دیاری دەکات و ئاراستەیان دەکات. (الحسن: ١٠١).

لێرەوە پسپۆڕانی سۆسیۆلۆژی و سایکۆلۆژی لە ڕێی چەندین تیۆریی شیکاری و ڕاڤەکارییەوە لێکدانەوەی زانستی بۆ گێچەڵی سێکسی دەکەن. لەوانە:

پرۆفیسۆری یاریدەدەر (د. عالیە فەرەج) پسپۆڕی کۆمەڵناسی و مامۆستا لە زانکۆی سلێمانی، ڕوونی کردەوە کە تیۆرە شکارییەکان کە تایبەتن بە شیکردنەوەی گێچەڵی سێکسی بریتین لە:

- **ئاراستەی ڕێکخستن:** تەرکیز دەکاتە سەر شێوازەکانی گێچەڵی سێکسی و پشت دەبەستێت بە هەریەکە لە: بوونی هەردوو ڕەگەز لە دامەزراوەکاندا (وەکوو زانکۆ)، جیاوازیی کولتووری

و باكگراوندی كۆمەڵایەتیی هەردوو ڕەگەز، كەمی یان لاوازیی ڕێوشوێنە یاساییەكانی ناو دامەزراوەكان بۆ ڕێگرتن لە گێچەڵی سێكسی.

- **ئاراستەی كۆمەڵایەتیی كولتووری:** تەركیز دەكاتە سەر ئامادەیی پیاوسالاری لە زۆربەی كۆمەڵگەكاندا و بوونی پێگە و ڕۆڵ و هێز و دەسەڵات لای پیاوان وەكوو ئەنجامێكی پێگەیاندنی كۆمەڵایەتی لەلایەن خێزانەوە، ئەم جۆرە كۆمەڵگەیانە گێچەڵی سێكسی بە پرسێكی كۆمەڵگەیی ئەژمار دەكەن و ڕەگەزی مێینە ڕادێنن لەسەر قەبوڵكردنی گێچەڵی سێكسی بە پاساوی پاراستنی ناو و شۆرەت و ژیانی كۆمەڵایەتیی ژنان خۆیان. لە كاتی ئەنجامدانی توێژینەوە لەم جۆرە كۆمەڵگەیەدا پێویستە توێژەر تەركیز بكاتە سەر ڕۆڵی هەریەكە لە: ڕەگەز، چین، پێگە، داینەمیكیەتی هێز و دەسەڵات لەسەر ئاستی تاكەكان و ئاستی ڕێكخستن و ئاستی كۆمەڵایەتی و كولتووری.
- **ئاراستەی ڕۆڵی ڕەگەز:** تەركیز دەكاتە سەر گرێدانی هەردوو ئاراستەی پێشەوە بە یەكەوە بە لەبەرچاوگرتنی جیاوازیی پێگەی ڕۆڵی ژن و پیاو لەناو دامەزراوە و لەناو كۆمەڵگە و بەبەردەوامی بالابوونی پێگەی ڕۆڵی پیاو، هەروەها تەركیز دەكاتە سەر وێنای ژن لای پیاو كە كاریگەریی ڕەهەندی سێكسی و ئەركی سێكسیی ژن لە سەنتەری ئەو وێنایە دایە، بۆیە بەبەردەوامی ژنان ڕووبەڕووی گێچەڵی سێكسی دەبنەوە. (فرج: چاوپێكەوتن ٢٠١٩/٣/١).

كۆمەڵێكی تر لە توێژەرانی بواری سۆسیۆلۆژی پێیان وایە گێچەڵی سێكسی ڕوو دەدات لە دەرەنجامی ململانێی نێوان حەز و ڕەمەك –غريزة– و ئارەزووەكانی تاك و ئەو یاسا و ڕێسا

کۆمەڵایەتییانەی (وەک کۆت و بەند) ڕێنا دەن ئەو حەز و ئارەزووانە ڕێچکەی لادان بگرنە بەر، لەبەر ئەوە دوور نییە گێچەڵی سێکسی لەم حاڵەتەدا لە ئەنجامی سەرنەکەوتنی توندوتۆڵی کۆمەڵایەتی – الضبط الاجتماعي- بێت، وەک ئەوەی گێچەڵی سێکسی هەڵهاتن و دەربازبوون بێت لەو کۆت و بەندانە. (اسعد احمد جمعة و عارف اسعد جمعة، ١٤٣٠هـ-٢٠١١م: ٧٤).

گروپێکی تر لە پسپۆڕانی سۆسیۆلۆژی لێکدانەوەیەکی جێندەری بۆ گێچەڵی سێکسی دەکەن و لێکدانەوە و بیروبۆچوونەکانی ژنان بەرجەستە دەکەن و پێیان وایە، گێچەڵی سێکسی بەرجەستەبوونی هەژموونی پیاوسالارییە؛ ئەو هەژموونەی ڕێ دەدات ڕەگەزی نێر هێزی سێکسی لە ڕێی گێچەڵی سێکسییەوە بخەنە گەڕ، بۆ چەسپاندن و سەلماندنی زاڵبوونی پیاو و سەرلەنوێ بەرهەمهێنانی ئەو دەسەڵاتە. ڕاڤەکارانی ئەم ئاراستەیە گێچەڵی سێکسی دەبەستنەوە بە پێگەیاندنی کۆمەڵایەتی پشتبەستوو بە جێندەر، بە بۆچوونی ئەمان، ئەم جۆرە پێگەیاندنە جێندەرییە (جۆری کۆمەڵایەتی)ی هێزی نابەرامبەر بەرهەم دەهێنێت و پارێزگاریی لێ دەکات و هاوسەنگی و بالانسی ڕەگەزیی نێوان نێر و مێ تێک دەدات. لێرەوە ئەم ئاراستەیە جەخت دەکاتەوە لە (جۆر)، (هێز)، (پێگە). (عبادة:٢٧).

- **پسپۆڕانی سایکۆلۆژیش** لێکدانەوەیەکی سایکۆلۆژییانە بۆ گێچەڵی سێکسی دەکەن و پێیان وایە ئەم جۆرەی لادانی کۆمەڵایەتی لە (نەگونجان و نەسازانی کۆمەڵایەتییەوە) سەرچاوە دەگرێت؛ چوونکە کاتێ مرۆڤ نائومێد دەبێت.لە ژیان لە کۆمەڵگەکەی یان دەبینێت حەز و ئارەزووەکانی و ئامانجەکانی بەدەست ناهێنێت و شکست دەهێنێت لە گونجان لەگەڵ یاسا و ڕێساکانی کۆمەڵگە، لێرەوە گیانی شەڕەنگێزی زاڵ دەبێت و گێچەڵکار پەنا

بۆ ئەنجامدانی ئەم جۆرە تاوانانە دەبات کە خۆی لە سزادانی کۆمەڵگەدا دەبینێتەوە، کە پێچەوانەی بەها کۆمەڵایەتییەکانە. (ڕاجح، بلا: ٥٧٠).

## باسی دووەم - پاڵنەرەکانی گێچەڵی سێکسی:

هەر وەک لە پێشەکیدا وتمان، گێچەڵی سێکسی ڕوو دەدات لە دەرەنجامی کۆمەڵێک پاڵنەری پەروەردەیی، کۆمەڵایەتی، ئابووری، کولتووری. ئەوەی گرنگە لێرەدا بوترێ پێش قسەکردن لەسەر پاڵنەرەکان، ئەمەیە کە: مەرج نییە هەرکەس یەکێک یان زیاتر لەم پاڵنەرانەی تێدا بوو، ئیتر بە گێچەڵکار لەقەڵەم بدرێت، یان ئەو پاڵنەرانە هاندەر بن بۆ ئەنجامدانی گێچەڵی سێکسی، چوونکە کەسانێک هەن زیاتر لە پاڵنەرێکی گێچەڵی سێکسی لە ژیانیاندا بوونی هەیە (هەژاری و دواکەوتنی تەمەنی هاوسەری وەک نموونە)، بەڵام نەک گێچەڵی سێکسی ئەنجام نادەن، بەڵکوو بە ڕەفتارێکی ناشەرعی و پرۆسەیەکی نەزۆک و نائەخلاقی و نامرۆیی لەقەڵەمی دەدەن.

بە بۆچوونی ئێمە گرنگترین پاڵنەرەکانی گێچەڵی سێکسی ئەمانەن:

١. لاوازیی قەدەغەکاری -وازع-ی ئایینی: لە گرنگرترین ڕێکارەکانی پەروەردەی ئیسلامی و قەدەغەکارییە ئایینییەکانی ئیسلام ئەمانەن: (خۆشەویستی بۆ خوای گەورە، ترس لە تووڕەیی و سزاکانی، بەهێزی و بەردەوامیی «نەفسی لۆمەکار»، خۆپاراستن لە حەرامکراوەکان و تێنەپەڕاندنی ئەو سنوورانەی شەریعەت دیاریی کردوون). نەبوون یان لاوازیی ئەم جۆرە پەروەردە و بەربەست و قەدەغەکاری (وازع)انە، ڕێخۆشکەرن بۆ ئەنجامدانی

تاوان و سەرپێچی، لەناویشیاندا (گێچەڵی سێکسی). بۆیە بە بڕوای ئێمە دەروازەی سەرەکی بۆ هاتنەناوەوەی سەرجەم پاڵنەرەکانی تری گێچەڵی سێکسی، نەبوونی چاودێری خودی و سستیی بەرگریی بیروباوەڕ و بەرگریی دەروونییە. خوای گەورەش دەفەرموویت: ﴿وَنَفْسٍ وَمَا سَوَّاهَا ۞ فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَاهَا ۞ قَدْ أَفْلَحَ مَنْ زَكَّاهَا ۞ وَقَدْ خَابَ مَنْ دَسَّاهَا﴾ سورەتی الشمس: ئایەتی ٧-١٠.

٢. میدیا و سۆشیال میدیا: میدیا دادەنرێت بە یەکێک لە سەرەکیترین پاڵنەری هاندان بۆ ئەنجامدانی گێچەڵی سێکسی؛ ئەوەش لە ڕێی بڵاوکرنەوەی بابەتە ئیباحی و وروژێنەرەکان و ناساندنی ڕەگەزی مێ وەک شمەکێک و نمایشکردنی ئافرەتان بەڕووتی و ڕازاوەیی و گۆرانیوتن و ڕیکلامی بازرگانی و هتد... هەروەها ڕۆڵی میدیا (بینراو، بیستراو، خوێنراو) لە گەشەپێدان و برەوپێدانی دیاردەی گێچەڵی سێکسی کەم نییە، بەتایبەت لەم سەردەمەدا کە تۆڕی جاڵجاڵۆکەیی (بەتایبەت تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان) و کەناڵە ئاسمانییەکان و مۆبایل و دەزگاکانی تری ڕاگەیاندن، لەبریی هۆشیاریی ئایینی و کۆمەڵایەتی و کارکردن بە دیوی چاکسازی و چاکەکاری، بە پێچەوانەوە کاری (هەندێ) لە میدیاکان و تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان بووەتە کارێکی تێکدەرانە و سووککردنی بەها و ئاکارە کۆمەڵایەتییەکان و دروستکردنی مەترسی لەسەر تاک و خێزان و کۆمەڵ. (الشنقیطی، ١٩٩٨: ١٥٩-١٦٠.) توێژینەوە مەیدانییەکانیش ئەوەیان ئاشکرا کردووە، کە تاکی کۆمەڵگە ڕۆژهەڵاتییەکان بە ڕێژەی ٨٠٪ تەماشاکردنی دراماکان و کارە هونەرییەکان و زنجیرە دۆبلاژکراوەکانی بەلاوە گرنگترە، بە بەراورد بە جۆرەکانی

تری میدیا لە (بیستراو، بینراو، خوێنراو). (المحیا: ١٤١٤هـ: ١٣٦). هەروەها توێژینەوە مەیدانییەکان ڕۆڵی دراماکان لەسەر ڕەفتاری تاک بەگشتی و هەرزەکاران بەتایبەتی دەخەنە ڕوو، لەو توێژینەوانەش: توێژینەوەکەی (عبدالحلیم،١٤٠٤ هـ - ١٩٨٤م: ٢٤٢) کە لە ڕاپرسییەکەیدا، ٦٠٪ی بەشداربووان (کە خوێندکاری زانکۆن) دانیان بەوەدا ناوە کە ڕەفتاریان بە شێوەیەک لە شێوەکان کەوتووەتە ژێر کاریگەریی دراماکان و زنجیرە تەلەڤیزیۆنییەکان. هەروەها توێژینەوە مەیدانییەکەی (طوالبیة وئام و ماجن أسماء) کە تایبەتە بە گێچەڵی سێکسی لە ڕێی ئینتەرنێتەوە، ئەوەی ئاشکرا کردووە، کە ٥٤٪ی بەشداربووانی ڕاپرسییەکەیان (لە ڕەگەزی مێ) ڕایان گەیاندووە لە ڕێی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکانەوە گێچەڵی سێکسییان بەرامبەر کراوە. هاوکات ٤٨٪ (لە هەردوو ڕەگەزی نێر و مێ) ڕایان گەیاندووە کە ئەوان لە ڕێی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکانەوە پەیوەندیی سۆزدارییان بەستووە. (وئام وأسماء، ١٤١٥هـ: ١٢٣).

٣. **توندوتیژیی خێزانی و پەروەردەی ناتەندروست:** بەپێی توێژینەوە ئەنجامدراوەکان، یەکێک لە هۆکارە سەرەکییەکانی گێچەڵی سێکسی، لە توندوتیژی و ناتەبایی خێزانی و پەروەردەی ناتەندروستەوە سەرچاوە دەگرێت. ئەم ژینگە ناتەندروستەش کاریگەریی نەرێنی و مەترسیدار لەسەر ڕەفتاری منداڵان و هەرزەکاران و نەوجەوانان جێ دێڵێت و کاریگەریی لەسەر پێکهاتەی دەروونی و کۆمەڵایەتی و پێکهاتەی کەسێتییان دەبێت و دەبێتە هۆی تێکچوون و شڵەژانی دەروونییان و دواتریش کاریگەریی لەسەر دەروونتەندروستییان دەبێت.

لە گرنگترین سیماکانی پەروەردەی خێزانی ناتەندروستیش ئەمانەن:

- بێبەشبوون لە چاودێریکرن و گرنگیدانی دایک و باوک.
- شکاندنەوە و سەرزەنشتکردنی بەردەوام و هەستکردنی منداڵ بەوەی کە بێزراو و پەسەندنەکراوە.
- زێدەڕۆیی دایک و باوک لە لێبوردن و بەخشینی منداڵەکانیان.
- زیدەڕۆیی لە گرنگیدان بەمناڵ و چاودێریکردن و سەرپەرشتیکردنیان.
- توندوتیژی و چەوساندنەوە و داپلۆسینی ڕۆڵەکانیان لەلایەن دایک و باوکەوە.
- تێڕوانین و ئاراستە دژبەیەکەکانی دایک و باوک.
- هەستکردن بە کەمی، توندوتیژیی جەستەیی و دەروونی.

ئەم ژینگە خێزانییە ناتەندروستە، پاڵنەر و یارمەتیدەرە بۆ بەهێزکردنی گیانی تۆڵەسەندنەوە و شەڕەنگێزی و خۆخاڵیکردنەوە لە کەسی گێچەڵکاردا. (بڕوانە: منظمة الصحة العالمية,٢٠٠٢: ٢٦. عاشور وآخرون، ٢٠٠٩: ٢٩-٣٠. عبدالصمد، ٢٠٠٧: ١٤٩. فەهمی، ٢٠١٢: ١٠١).

لە گرنگترین ئەو توێژینەوە مەیدانییانەش کە لە گێچەڵی سێکسیی کۆڵیوەتەوە، توێژینەوەکەی پرۆفیسۆر (مدیحە احمد عبادەیە) کە ئاشکرای کردووە کە ٦٠٪ی ئەوانەی چاوپێکەوتنی لەگەڵ ئەنجام داون و گێچەڵی سێکسییان بەرامبەر ئەنجام دراوە، ڕایان گەیاندووە کە بێسەروبەری و هەڵوەشانەوەی خێزان و پێگەیاندنی ناتەندروستی خێزان، کاریگەریی ڕاستەخۆیان هەیە لەسەر گێچەڵی سێکسی (عبادة: ١٣٦).

**٤. تێکەڵاویی هەردوو ڕەگەزی نێر و مێ:** بە هۆی نزیکیی هەردوو ڕەگەز لە یەکترەوە و تێکەڵاوبوونیان، هەلی گێچەڵی سێکسی زیاتر دەبێت، بەتایبەت لە شوێنی کارکردن، وەک کارگە و کۆمپانیاکان، زانکۆ و پەیمانگاکان، یان شوێنی گەشتوگوزار و قاوەخانەکان

تایبەت بە هەردوو ڕەگەز. بەپێی توێژینەوەکانیش کە لە وڵاتانی ڕۆژئاوا ئەنجام دراون، گێچەڵی سێکسی لە ڕیزی کارمەندانی فەرمانگە حکومییەکان ڕوو لە زۆربوونە، بەپێی توێژینەوەیەکیش کە لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا ئەنجام دراوە، ٩٢٪ی ئەوانەی لە فەرمانگە حکومییەکان کار دەکەن ڕووبەڕووی گێچەڵی سێکسی بوونەتەوە، لە توێژینەوەیەکی تردا کە لەسەر دەستەیەک لە خوێنکارانی کۆمەڵگەی ئەمەریکی ئەنجام دراوە، ٧٠٪ی خوێندکارانی ڕەگەزی مێ ڕایان گەیاندووە کە لەلایەن هاوڕێ کوڕەکانیان یان مامۆستاکانیان ڕووبەڕووی گێچەڵی سێکسی بوونەتەوە. (بڕوانە: فرج، ٢٠١١: ٢٦. Asyan Sever, 188).

لەسەر ئاستی کوردستانیش –وەک پێشتر ئاماژەمان پێ دا- بەپێی ڕاپرسییەکەی ڕێکخراوی Public Aid Organizationی نەرویجی-PAO- ٧٣٪ی کچان لە بازاڕ و لەناو حەرەمی زانکۆ و پەیمانگاکاندا ڕووبەڕووی گێچەڵی سێکسی بوونەتەوە، لە سەددا ١٣ی ئەنجامدەرانیش مامۆستایان و ئەندامانی ڕێکخراوە خوێندکاری و قوتابییەکان و کارمەندانی زانکۆ و پەیمانگاکانن.). (سایتی ڕێکخراوی فریاکەوتنی میللی PAO – سایتی خەندان: ٢٠١٧/١٢/٢٥).

تەنانەت گێچەڵی سێکسی لەلایەن کەسە نزیکەکانەوە (باوک، برا، خاڵ، مام) وەک توێژینەوە مەیدانییەکان ئاشکرایان کردووە، یەکێک لە پاڵنەرەکانی تێکەڵاویکردنە لەگەڵ کەسانی بێگانە (نامەحرەم) لە دەرەوە، بەڵام ئەم کەسە نزیکانە لەگەڵ کەسی نزیکیان بەناچاری خۆیان خاڵی دەکەنەوە. (موسی و زين العايش، ١٤٢٩هـ: ٢١٤).

**٥. بارودۆخی ئابووری:** وەک بێکاری و دەستبەتاڵی، بارگرانی و تێچووی زۆری پرۆسەی هاوسەرگیری، هەژاری، گرانی و زۆریی مارەیی... هتد. ئەمەش وا دەکات هەندێ لە هەرزەکاران بۆ تێپەڕاندنی گرێ

دەروونییەکانی وابەستە بە سێکس و تێرکردنی پاڵنەری سێکس، پەنا بۆ ڕێگاکانی لادانی سێکسی بەرن، لەوانەش گێچەڵی سێکسی.

٦. **پاڵنەرەکانی تر، وەک:**

- تێرنەبوونی پێداویستییە بنەڕەتییەکان (بەتایبەت پێداویستیی سێکس).
- سەقەتی و ناتەواویی پرۆگرامەکانی خوێندن، بەتایبەت لایەنی دەروونی و دەروونذروستیی خوێندکار (منداڵ، هەرزەکار، نەوجەوان).
- لاوازیی سیستمی سزادان لەلایەن دەوڵەتەوە بۆ ئەنجامدەرانی لادانە سێکسییەکان، لەناویشیاندا گێچەڵی سێکسی.
- مانەوەی هەندێ لە ئافرەتان لە دەرەوەی ماڵەوە بۆ کاتێکی درەنگانی شەو.
- ئالوودەبوون بە ماددە هۆشبەرەکان.
- گرووپی هاوڕێیان - هاوڕێی خراپ.
- قەرەباڵغیی ناو بازاڕەکان و مۆڵەکان و ناو هەندێ لە هۆکارەکانی هاتوچۆ (پاس، شەمەندەفەر، میترۆ).
- بێدەنگیی گێچەڵپێکراو (ڕەگەزی مێ).
- تەنهایی یان پێکەوەژیانکردنی نێر و مێی نامەحرەم.
- چاونەگرتن و چاودانەخستن لە ئاست کەسانی نامەحرەم.
- نەبوونی هۆشیاریی سێکسی لە پرۆگرامەکانی خوێندن.
- لاوازیی ناوەندەکانی پەروەردە (خێزان، ناوەندە زانستی و ئەکادیمییەکان، مزگەوت) لە ڕووبەڕووبوونەوەی گێچەڵی سێکسی.

- ⮘ تەمەن (بەو پێیەی زۆربەی ئەنجامدەرانی گێچەڵی سێکسی لە قۆناغی هەرزەکاریدان و تەمەنیان لەنێوان ١٨-٢٩ ساڵە).

(بڕوانە: عبدالصمد: ١٥٠-١٥١. العبدالمنعم: ٩١،٩٩. شويش وعبدالحی، ٢٠٠٧: ٣٨ -٣٩. عاشور: ٣٩-٤٠).

**لە وەڵامی ئەو پرسیارەی نووسەریش کە ئایا پاڵنەرەکانی ئەنجامدانی گێچەڵی سێکسی چین؟**

پرۆفیسۆری یاریدەدەر (د. عالیە فەرەج) پسپۆڕی سۆسیۆلۆژی و مامۆستا لە زانکۆی سلێمانی، هەروەها دادوەر (بەختیار محمد علی) بەڕێوەبەری فەرمانگەی داواکاری گشتیی هەڵەبجە، ئاماژەیان بە چەند پاڵنەرێک کرد، لەوانە:

- ✓ خۆخاڵیکردنەوەی تاوانکار گەرچی کەمیش بێت، بە هۆی سەرلیشێواوی و پەروەردەی هەڵەی ئەو تاکە، نەبوونی بەرنامەیەکی پەروەردەیی تەندروست لەسەر ئاستی تاک، خێزان، کۆمەڵگە، دەسەلات – دەوڵەت.
- ✓ لاساییکردنەوەی تاوانکار بە هۆی کاریگەرییە دەرەکییەکان، بەتایبەت میدیا و سۆشیال میدیا و فیلمە دۆبلاژکراوەکان.
- ✓ خۆڕازاندنەوەی زیادی ئافرەتان و لادان لە عورفی کۆمەڵگە و ڕێنماییە ئیسلامییەکان و زیادەڕۆیی لە تێکەڵبوونی هەردوو ڕەگەز.
- ✓ لاوازیی بەرەنگاربونەوەی کۆمەڵایەتیی کۆمەڵگە بۆ کردارە شەرمئاوەرەکان کە پێیان دەوترێ (بەرگریی کۆمەڵگە)، کە خۆیان دەبیننەوە لە بەها کۆمەڵایەتییەکاندا و دەستگرتن پێیانەوە.
- ✓ لەسەر ئاستی دەوڵەتیش، کاردانەوە و کارڕایەکان بەهێز نین، هەرچەندە یاسا سزای توندی بۆ ئەم جۆرە ڕەفتارانە داناوە.

(فەرەج، چاوپێکەوتن،٢٠١٩/٣/١. علی، چاوپێکەوتن، ٢٠١٩/٢/٢٥).

## باسی سێیەم - دەرهاویشتەکانی گێچەڵی سێکسی:

گومان لەوەدا نییە کە گێچەڵی سێکسی کۆمەڵێک دەرهاویشتە و لێکەوتەی مەترسیدار جێ دێڵێت؛ چ لەسەر کەسی گێچەڵکار، چ لەسەر کەسی گێچەڵپێکراو، چ لەسەر گرووپەکان و کۆمەڵگە و دەوڵەت. ئەنجامەکانی توێژینەوە مەیدانییەکانیش ئەو ڕاستییەیان سەلماندووە کە گێچەڵی سێکسی کاریگەریی نەرێنیی مەترسیدار لەسەر کەسی قوربانی -گێچەڵپێکراو- جێ دێڵێت، وەک ئەو توێژینەوەیەی کە لە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا ئەنجام دراوە و دەر کەوتووە کە ٦٠٪ی بەشداربووان دانیان بەوەدا ناوە کە گێچەڵی سێکسی کاریگەریی خراپی لەسەریان دروست کردووە، وەک تووڕەبوون، زیادبوونی دڵەڕاوکێ، نائارمی و بێزاری، هەستکردن بە ترس. (وئام وأسماء: ٥١).... هەروەها توێژینەوەکەی (مدیحة احمدعبادة) کە ئاشکرای کردووە ٥١٪ی بەشداربووان پێیان وا بووە هەست بە ترس دەکەن، وە ٥٢٪ هەست بە ڕقلێبوونەوە و بێزاری دەکەن بەرامبەر پیاوان، وە ٤٥٪ هەست بە ترس و دڵەڕاوکێ و شەرمەزاری دەکەن. (عبادة: بلا، ١٣٩).

ئەوەی گرنگە لێرەدا ئاماژەی پێ بدرێ ئەوەیە کە لێکەوتە و دەرەنجامە مەترسیدارەکانی گێچەڵی سێکسی، هەروەها کاریگەرییەکانی فرەڕەهەندە و دەکرێ بەسەر چوار ئاستدا دابەش و پۆلێن بکرێن:

### ئاستی یەکەم: کەسی بکەری گێچەڵی سێکسی (گێچەڵکار):

سەرباری ئەوەی کەسی گێچەڵکار چێژێکی کاتی لەم ڕەفتارە لادەرە وەر دەگرێت، بەڵام ڕووبەڕووی چەندین کێشەی دەروونی و ڕەفتاری و ئاکاری دەبێتەوە، لەوانەش:

١. بە دووبارەبوونەوە و تێپەڕبوونی کات، گێچەڵی سێکسی دەبێتە خوویەک -عادەتێک-ی زیهنی بۆ کەسی ئەنجامدەری ڕەفتارەکە، وەکوو پێداویستییەکی ڕۆژانە بۆ خۆی وێنای دەکات.
٢. گۆڕانی وێنای مێینە لای کەسی ئەنجامدەری گێچەڵی سێکسی لە مرۆڤێکەوە بۆ ئامراز و بابەتی گێچەڵی سێکسی، بەوەش پەیوەندییەکانی بە ڕەگەزی بەرامبەرەوە بەرەو نائاساییبوون و تەنگەژەبوون هەنگاو دەنێت.
٣. لە دووبارەبوونەوەی سەرزەنشت و ڕووبەڕووبوونەوەکانی کەسانی دەوروبەر بە کەسی ئەنجامدەری گێچەڵی سێکسی، ئەو باوەڕەی لا دروست دەبێت کە کەسێکی بێزراوە و قەبوڵکراو نییە لای کەسانی دەوروبەری و سەرەئەنجام دووچاری شڵەژانی دەروونی دەبێت و بەرەو نامۆبوون مل دەنێت. (فەرەج: چاوپێکەوتن:١/٣/٢٠١٩. محمد فرج والهريدي: ١٩/١٠/٢٠٠٤: سلیم، بلا: ٤٦).

**دووەم - کاریگەریی گێچەڵی سێکسی لەسەر کەسی گێچەڵپێکراو:**

١. ترس و دڵەڕاوکێ و سەرزەشتی دەروونیی بەردەوام.
٢. خەوزڕان و مۆتەکە و خەونبینینی ناخۆش و خەمۆکی.
٣. هەستکردن بە تاوان و شەرمەزاری و تەریقبوونەوە و خۆبەکەمزانین.
٤. ڕقلێبوونەوە و تێڕوانینی نێگەتیڤانە بۆ ڕەگەزی بەرامبەر.
٥. تووڕەبوون و هەستکردن بە گۆشەگیری و نامۆبوون.
٦. تێکشکانی دەروونی و لەدەستدانی متمانە بە خۆ.
٧. وروژاندنی حەزی سێکسی لای ڕەگەزی مێ و پەنابردن بۆ ئەنجامدانی کاری سێکسیی ناشەرعی.

٨. تێکچوونی باری تەندروستیی جەستەیی و دەروونتدروستی و ژیانی کۆمەڵایەتی و خێزانی و هەندێ جاریش دروستبوونی حاڵەتەکانی جیابوونەوە (تەڵاق)، پەنابردن بۆ خۆکوشتن. (عبادة: ١٣٩. فاید و زکی: ٥٨-٥٩. صلاح، بلا: ٤)

**سێیەم - کاریگەریی گێچەڵی سێکسی لەسەر ئاستی دامەزراوە و گروپەکان:**

١. گێچەڵی سێکسی دەبێتە سەرچاوەی لاوازبوون یان نەمانی متمانە لەنێوان فەرمانبەران و تاکەکانی دامودەزگاکان (حکومی، ئەهلی).
٢. گێچەڵی سێکسی هۆکاری کاریگەرە لە لاوازبوونی پەیوەندیی نێوان کەسەکانی هەمان دامەزراوە یان گروپ، بەوەش ئاستی ئەدای کار دادەبەزێت، جا ئیتر کارەکە ئیداری بێت یان بەرهەمهێنان، ئەهلی بێت یان حکومی.
٣. گێچەڵی سێکسی هۆکاری بنەڕەتییە بۆ لاوازبوونی سیستمی بەهایی لەناو دامەزراوە و گروپەکاندا. (فەرەج: چاوپێکەوتن:١/٣/٢٠١٩).
٤. دابەزینی ئاستی بەرهەمهێنان و زیادبوونی ململانێی نێوان گروپی کار.
٥. دابەزینی هەلی سەرکەوتن لە بەدەستهێنانی ئامانجە داراییەکان.
٦. دابەزینی ئاستی ڕازیبوونی وەزیفی.
٧. لەدەستدانی فەرمانبەرانی ڕەگەزی مێ بە هۆی وازهێنان بۆ خۆپاراستن لە دەرهاویشتەکانی گێچەڵی سێکسی.
٨. زۆربوونی حاڵەتەکانی ئامادەنەبوون لەلایەن ئەو ئافرەتانەی ڕووبەڕووی گێچەڵ دەبنەوە.
٩. بەرزبوونەوەی تێچووی چاودێریی تەندروستی و تێچووی نەخۆشەکان، دەرەنجامی ئاسەوارەکانی گێچەڵی سێکسی. (ایمان ومحمد، ٢٠١٧: ٦٢. عبدالباقی، ٢٠٠٨: ١٥_-١٦).

**چوارەم - كاريگەريی گێچەڵی سێكسی لەسەر ئاستی كۆمەڵگە:**

١. بوون بە دیاردەی گێچەڵی سێكسی هۆكارە بۆ نەمان یان لاوازبوونی ئاساییشی كۆمەڵایەتی و ئینتیمای ڕەگەزی مێینە بۆ كۆمەڵگە.

٢. گێچەڵی سێكسی سەرچاوەیە بۆ زۆرێک لە گرفتە دەروونی و كۆمەڵایەتییەكانی خێزانەكان.

٣. گێچەڵی سێكسی بودجەیەكی زەبەلاح دەسەپێنێت بەسەر دەسەڵاتدا بۆ پێشكەشكردنی خومەتگوزاریی دەروونی و كۆمەڵایەتی بە قوربانییان و ڕزگاربووانی گێچەڵی سێكسی. (عبدالباقی: ١٧-١٨. عبادة: ١٤١. فاید و زكی:٦٢).



# تویژیەندی سێیەم

## شتراتیژیەتی ڕووبەڕووبوونەوەی کێچەڵی سێکسی

دیاردەی کێچەڵی سێکسی دیاردەیەکی ئاڵۆزە و ڕووبەڕووبوونەوە و چارەسەرکردنی پێویستی بە ستراتیژیەتێکی هەمەلایەنە هەیە؛ چ لە سەر ئاستی تاک، چ لهسەر ئاستی خێزان، چ لەسەر ئاستی کۆمەڵ، چ لەسەر ئاستی دەوڵەت و دەزگاکانی. لەم بارەیەوە، وە بە مەبەستی پاراستنی ئاساییشی کۆمەڵگە و بەردەوامبوونی ئارامی و ئاشتیی کۆمەلایەتی، ئایینی ئیسلام سێ پایەی بەهێز و تۆکمەی داناوە:

**پایەی یەکەم:** توندوتۆڵکردنی ڕێکاری خودی و چاودێریی خودی لە ناخی مۆڤەکان. (رقابة ذاتیة).

**پایەی دووەم:** ڕێکاری کۆمەلایەتی، کە لە کۆمەڵگەوە سەرچاوە دەگرێت و ئەرکێکی گەورەی لەسەر بونیاد دەنرێت کە فەرمانکردن بە چاکە و ڕێگری لە خراپەیە.

**پایەی سێیەم:** ڕێکارەکانی دەوڵەت، کە لە ڕێیەوە سزاکان جێبەجێ دەکات بەسەر ئەو کەسانەدا سنوورەکان تێدەپەڕێنن و سەرپێچیی یاساکان دەکەن. (سلیم، ١٩٨٥: ٣٧).

بە گەڕانەوەشمان بۆ قورئانی پیرۆز و فەرموودەکانی پێغەمبەری ئیسلام (دروودی خوای لەسەر بێت) و ڕای بیرمەندان

و پەروەردەکارانی ئیسلام، ئەو ڕاستییەمان بۆ دەر دەکەوێت کە مامەڵەی دروست لەگەڵ هەرجۆرە لادانێک (لەناویشیاندا گێچەڵی سێکسی) دوو جۆر لە ڕێکار و میکانیزمی پێویستە:

جۆری یەکەم: ڕێکار و میکانیزمە پارێزیارییەکان (الاليات الوقائية) کە بەرگری لە تاکدا بەهێز دەکەن بۆ خۆپاراستن و دوورکەوتنەوە لە هەرجۆرە لادان و ڕەفتارێکی ناتەندروست. لە ڕێوشوێن و هەنگاوەکانی ئەم جۆرە میکانیزمانەش: بەهێزکردنی قەدەغەکار (وازع)ی ئایینی، پەروەردەی ئیمانی، پەروەردەی ڕۆحی و پەرستشەکان. پەروەردەی ڕەفتاری و ئاکاری. پەروەردەی سێکسی.

جۆری دووەم: ڕێکار و میکانیزمە چارەسەرییەکان وسزاییەکان (الاليات العلاجية والعقابية). کە ئەمانیش ڕووبەڕووی ئەو کەسانە دەکرێنەوە کە سەرپێچیی فەرمانی خوای گەورە دەکەن و سنوورەکانی شەریعەتیان بەزاندووە. لە گرنگترین ڕێوشوێن و هەنگاوەکانی ئەم جۆرە ڕێکار و میکانیزمانەش: چاکسازی، تەمێکردن، سزادان.

لەم توێژبەندەدا، هەوڵ دەدەین -پشت بە خوای گەورە- ستراتیژیەتێکی هەمەلایەنە و گشتگیر بخەینە ڕوو بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی گێچەڵی سێکسی، ئەمەش بە گرتنەبەری هەردوو جۆری میکانیزمەکانی ئاماژەپێدراو، بەم شێوەی لای خوارەوە:

### یەکەم - پەروەردەی سێکسی:

قسەکردن دەربارەی پەروەردەی سێکسی، قسەکردنە سەبارەت بە لایەنێکی زۆر کاریگەری (دەروونەندروستی)؛ چوونکە هەوڵدانە بۆ ڕامالین و ڕەواندنەوەی ئەو مەترسییانەی لەلای هەندێ لە باوکان و دایکان دروست دەبێت سەبارەت بە سێکس

و پاشــان زیادبوونــی تــرس و دڵەڕاوکێــی بــاوکان و دایــکان و پسـپۆڕانی بـواری پـەروەردە، لـەو دەنگـە نامۆیانـەی بـەردەوام کـە بـاس دەکـەن لـە (کرانـەوە) و (خۆدارنیـن) و (خۆداماڵیـن) لـە بەهـا بـالاکان و شـکاندنی قـەوارە و قـەڵای خێزان، لـە رێـی تەکنۆلوژیـا و ڕیکلامـی بازرگانـی و کەناڵـە ئاسـمانییەکان و تـۆڕە کۆمەڵایەتییـەکان و ئامرازەکانــی تــر کــە زۆر بــە ئاســانی لــە بەردەســت کچــان و کوڕانــی هەرزەکاردایــە و تەنــها بــە یــەک (کلیـک) سـەدان پێگـەی سێکسـی و ئیباحـی و دڵداری و سـۆزداری و وروژێنـەری سـێکس بەردەسـت دەبێـت.

زۆربـەی پسـپۆڕانی بـواری سـایکۆلۆژی –بەتایبـەت سـایکۆلۆژیی ئیسـلامی– لەسـەر ئـەوە کۆکن کـە پـەروەردەی سێکسـی بریتییـە لـە ئـەو پەروەردەیـەی کـە زانیاری و شـارەزایی ڕاسـت و دروسـت و ئاڕاسـتەی گونجاو دەداتە تاک، سەبارەت بە بابەتە سێکسییەکان، بە ئەندازەی ئەوەی کە گەشـەی جەسـتەیی و فیسـیۆلۆژی و ژیری و هەڵچوونی کۆمەڵایەتی ڕێـی پـێ دەدات، لـە چوارچێوەی ئایین و ئاکاردا، بـە مەبەسـتی گونجانـی دروسـت و لەبـار لـە هەڵوێسـتە سێکسـییەکان و ڕووبەڕووبوونـەوەی گرفتـە سێکسـییەکان لـە ئێسـتا و داهاتوودا، ڕووبەڕووبوونەوەیـەک کـە دروسـتیی سێکسـی مسـۆگەر بکات (علـوان،د ت: ٥).

بەدڵنیاییـەوە خۆدزینـەوە لـە باسـکردنی پـەروەردەی سێکسـی بـە پاسـاوی شـەرم و تـرس یـان گومانـی خـراپ پێبـردن، کارێکـە لـە شـوێنی خۆیـدا نییـە، چوونکـە هـەردوو ڕەگـەزی (کـوڕ و کـچ) ئەگـەر تێگەشـتنێکی ڕاسـت و دروسـتیان نەبوو سـەبارەت بە سـێکس و ڕێگای حەڵاڵـی تێرکردنـی و ئادابـە گشـتییەکانی کۆمەڵگـە، ئـەوا بـە دڵنیاییـەوە ڕێگای ناتەندروسـت و ناشـەرعی و میکانیزمـی حـەرام دەگرنـە بـەر بـۆ تێرکردنـی پاڵنـەری سێکسـی.

بە گەڕانەوەشمان بۆ سەردەمە پاکەکانی ئیسلام وەک سەردەمی پێغەمبەری خودا (درووودی خوای لەسەر بێت) و سەردەمی هاوەڵان و خولەفای ڕاشیدین (خوا لێیان ڕازی بێت)، سەرباری ئەو پاکی و پاکیزەییەی هاوەڵانی پێ ناسراوە، بەڵام لەیادیان نەچووبوو کە داوای ڕوونکردنەوە بکەن لە پێغەمبەری ئیسلام لە زانست و زانیارییەکانی تایبەت بە سێکس کە جێی بایەخیان بوو – وەک لە پێشەوە لە (دەستپێک - ماهیەتی سێکس باسمان کرد و چەندین بەڵگەی قورئانی پیرۆز و فەرموودەی سەحیح و وتەی زانایانمان وەک نموونە هێنایەوە. (زانیاری زیاتر لە: عبدالعزیز القوصی، ١٣٧١هـ - ١٩٥٢م: ٣٧٩. الشربینی،: ص ١٦٥. بدوی: ٣٦٥-٣٦٧. الطویل، د ت: ص٨)

گرنگی و بایەخی پەروەردەی سیکسی لەوەدایە کە ڕۆڵی کاریگەر دەبینێ لە سووککردنی شڵەژانی دەروونی و مسۆگەرکردنی دەروونددروستی، چوونکە لە کاتی نائامادەیی و نەبوونی پەروەردەی سێکسیی ڕاست و دروست چەندین گرفتی سێکسی سەر هەڵدەدات، لەوانە: گرفتەکانی گەشەی سێکسی، چەپاندنی سێکسی، بێسەروبەریی سێکسی، کەوتنەناو بۆتەی ئەویندارییی نادروست و ناشەرعی، نەبوونی زانیاریی دروست سەبارەت بە مامەڵەی گونجاو لەگەڵ ڕەگەزی بەرامبەر، دڵەڕاوکێی هاوسەری، ڕۆچوون لە خوێندنەوەی بابەتە سێکسییەکان، لادانی سێکسی و پەنابردن بۆ ڕێگا نادروستەکانی تێرکردنی سێکس، لاوازیی ڕێنمایی خێزانی، وە چەندین گرفتی تر... (زهران: ٤٥٢. بخیت،٢٠١٠. الحفنی، ٢٠٠٢: ٥ بۆ دواوە، کە بە شێوەیەکی زانستی و بەڵگەداری باس لە لادانە سێکسییەکان و چارەسەرەکانیان دەکات).

ئەوەی لێرەدا گرنگە ئاماژەیەکی کورتی پێ دەین، (میکانیزمەکانی پەروەردەی سێکسی)یە لە چوارچێوە ئیسلامییەکەی، کە لەمانەی خوارەوەدا خۆی دەبینێتەوە:

١. باڵاپۆشی و ڕێگری لە خۆڕووتکردنەوە و پابەندبوونی ڕەگەزی مێ بە پۆشاکی ئیسلامییەوە.

٢. چاوپاراستن، چوونکە بەهێزترین بەربەستە لە بەردەم هەرچەشنە لادانێکی سێکسی.

٣. دورکەوتنەوە و خۆپاراستن لە ورووژێنەرە سێکسییەکان؛ وەک: تەوقەکردن لەگەڵ کەسانی نامەحرەم، ژوان و تەنهایی لەگەڵ کەسانی نامەحرەم، تێکەڵاویی نادروست، تەماشاکردنی فیلم و دیمەنە سێکسییەکان –وەک وێنە و گرتەی ڤیدیۆیی- خوێندنەوەی چیرۆکە سیکسییەکان و گوێگرتنی لەو گۆرانییانەی کە ئافرەت وەک کاڵا بەکار دێنن...

٤. ئەنجامدانی پرۆسەی هاوسەرگیری. (بڕوانە: کریم عبدالله: ٢٩٧-٣٠٤).

**دووەم - بەگەڕخستنی دەزگا پەروەردەییەکان:**

- خێزان: نکوڵی لەوە ناکرێت کە خێزان سەرچاوەی ئاڕاستەکردن و دیارکردنی کەسایەتیی مرۆڤە بە هەردوو ئاڕاستەی نێگەتیڤ و پۆزەتیڤ.

ڕۆڵی خێزان لە ڕێگری و چارەسەری گێچەڵی سێکسی لەم چەند خاڵەدا خۆی دەبینێتەوە:

١. پەیوەندیی بەردەوام لەنێوان هەرزەکاران و نەوجەوانان و باوک و دایک، بۆ ئەوەی باوک و دایک ئاگادار بن لە ڕەفتاری منداڵەکانیان و وردەکارییەکانی ژیانیان و (چینی هاوڕێیانیان). چوونکە

منداڵ لەم تەمەنەدا سەرسامە و دەكەوێتە ژێر ورووژاندن و كاریگەرییەكانی دەزگاكانی ڕاگەیاندن و دابونەریتی كۆمەڵگە و فشاری هاوڕێیان و دۆستانی لە ناوەوە و دەرەوەی ناوەندەكانی فێربوون و ژینگەی كۆمەڵایەتی. (طالب، ٢٠٠٥: ١٢٥).

٢. دابینكردن و دەستەبەركردنی پێدوایستییە خۆڕسكەكانی مرۆڤ و تێركردنیان و پاڵفتەكردنی ڕەمەكەكان و دروستكردنی هاوسەنگی لەنێوان پاڵنەرەكان و (تەوزیفی) هەڵچوونەكان و پتەوكردنی پەیوەندییە كۆمەڵایەتییەكان لەنێوان ئەندامانی خێزان. (حمدان، ١٩٨٦ م- ١٤٠٦هـ:٤٢).

٣. زەرورەتی گرنگیدان بە پەروەردەی خێزانیی پشتبەستوو بە ئایین و زانست و كاركردن لەسەر بەهێزكردنی (چاودێریی خودی –الرقابة الذاتیة-) پشتبەستوو بە پەیوەندیی كەسەكان بە خوای گەورەوە. (فەرەج: چاوپێكەوتن ٢٠١٩/٣/١).

٤. ئاسانكاری بۆ ئەنجامدانی پرۆسەی هاوسەرگیری و كەمكردنەوەی كۆت و بەندەكانی ژنهێنان و شووكردن.

٥. گوێگرتن لە هەرزەكاران و نەوجەوانان و وەڵامدانەوەی پرسیارەكانیان، بەتایبەت ئەوەی پەیوەندیی بە سۆزداری و پەیوەندیی نێوان هەردوو ڕەگەزەوە هەیە.

• مزگەوت: لە كۆمەڵگە موسڵماننشینەكان، مزگەوت دادەنرێت بە دیارترین و كاریگەرترین ناوەندی پەروەردە و پێگەیاندن، وە دادەنرێت بە سەرچاوەی بڵاوكردنەوەی زانست و زانیاریی دروست و چاندنی تۆی ئاكارە جوانەكان و بەها باڵاكان. سەرباری ئەوەی مزگەوت شوێنێكە بۆ ئەنجامدانی پەرستشەكان، هاوكات دیارترین دوانگەشە بۆ تێگەیاندن و شارەزاكردنی تاكەكانی

کۆمەڵگە و ئاسەوارە پەروەردەییە دەروونی و کۆمەڵایەتی و ڕەفتارییەکانی، شاراوە نییە لای هەرکەس کە کەمترین شارەزایی لە مێژووی ئیسلام و ڕۆڵی مزگەوت بەتایبەت هەبێت و لە ئەرزی واقیع خۆی بێئاگا نەکات. (قطب، بلا: ١٠٩/١).

ڕۆڵی مزگەوت لە ڕووبەڕووبوونەوەی گێچەڵی سێکسی لەم خاڵانەدا دەخەینە ڕوو:

١. ئەکتیڤکردنی ڕۆڵی دامەزراوەی ئایینی، وەکوو مزگەوت و میدیای ئایینی بۆ کارکردن لەسەر چەسپاندنی بەها ئەرێنییەکان. (فەرەج: چاوپێکەوتن ٢٠١٩/٣/١. علی، چاوپێکەوتن: ٢٠١٩/٢/٢٥).

٢. ئامادەکردن و پێگەیاندنی پێشنوێژان و بانگخوازانێک، بە جۆرێک کە ئەم ئامادەکردنە بگونجێت لەگەڵ ڕۆڵ و ئەرکە بنەڕەتییەکانی مزگەوت لە ژیانی موسڵماناندا.

٣. ئامادەکردنی وتار و وانە و سیمیناری جۆراوجۆر کە نوێگەریی پێوە دیار بێت، وە بە شێوازێکی زانستی و پەروەردەیی و دوور لە هەڵچوون و هەڵەشەیی، ڕێنمایی موسڵمانان بکات بۆ ئاکارە جوانەکان و هۆشدارییان پێ بدات لە مەترسییەکانی لادانی کۆمەڵایەتی و لادانە سێکسییەکان.

٤. بەهێزکردنی پەیوەندیی کۆمەڵایەتیی نێوان پێشنوێژ و نوێژخوێنان، بەسەرکردنەوەی هەژاران و نەداران و چارەسەکردنی کێشەکانیان، چوونکە هەندێ جار کەمدەرامەتی و دەستکورتی پاڵنەرن بۆ لادانەکان، لەناویشیاندا لادانی سێکسی.

٥. بایەخدان بە پرۆژە و پرۆگرامی هۆشیارکردنەوە و ڕۆشنبیرکردن کە لە لایەک خەڵکی گەرەک (بەتایبەت هەرزەکاران و نەوجەوانان) سەرقاڵ بکات و کاتی بۆشایی و بێکارییان بۆ پڕ بکاتەوە، وە

لـە لايەكـى تـر ئـاگادار بـن لـە مەترسـييەكانى (شـالاَوى عەولەمـە) و (غـەزوى فيكـرى) و دانانـى پـلان و ميكانيزمـى دروسـت و گونجـاو بەرامبـەر شـتە نوێيـەكان و گۆڕانكارييـە كۆمەلاَيەتـى و كولتوورييـەكان.

لـە ڕێى ئـەم ميكانيزمانـەوە دەتوانرێت مزگـەوت بكرێتـە ناوەندێكى كاريگەر، چ وەك ناوەندێكى پارێزيارى، چ وەك ناوەندێكى چارەسەرى و ڕێگـرى لـە هـەر چەشـنە لادانێكـى ئـاكارى و ڕەفتـارى. (الحازمـى، ١٤٢٠هـ_ ٢٠٠٠م: ٣٠٠-_٣٠١. أحمد، ١٤٢٧هـ: ١٤٢_١٤٣).

- **ناوەندەكانى پەروەردە و فێركردن (باخچەى ساوايان، قوتابخانەكان، زانكۆ و پەيمانگاكان):**

ناوەندەكانى پەروەردە و فێركردن ئەو ناوەندانەن كە منالاَن و لاوان و نەوجەوانان لە ڕێيانەوە هەنگاوبەهەنگاو هەر لە مناڵييەوە كاروانى ژيانيان دەست پێ دەكات و دەكەونە ژێر كاريگەرييە پۆزەتيڤ و نێگەتيڤەكانيان.

ئـەم ناوەندانـە، چ وەك دەزگا و چ وەك ئۆرگانێكـى كۆمەلاَيەتـى، لەسـەر دەسـتى كۆمەڵگـە دامـەزراون بـۆ ئەوەى وەك چەند دەزگايەكى تايبـەت و پسـپۆڕ بـە ئەركـى خۆيـان هەسـتن لـە ڕووى پـەروەردە و فێركردنـەوە، وە گواستنەوە و گەياندنى كولتوورى نەوەكانى ڕابردوو بۆ نەوەكانى ئێستا. (الفرمـاوى، ١٤٣٠ هــ_ ٢٠٠٩م: ٢٦٥).

ناوەندەكانـى پـەروەردە و فێركـردن پێويسـتيان بـە كۆمەڵێـك پرنسـيپ و ميكانيـزم هەيـە تـا ببنـە ناوەندێكى كاريگـەر لـە دابينكردنـى كەشـوهەوايەكى ڕەفتـارى -سـلوك-ى تەندروسـت و پێگەيانـدنـى منـالاَن و هـەرزەكاران و نەوجەوانـان و پاراسـتنيان لـە هەرجـۆرە لادانێكـى هـزرى، ئـاكارى.

لە گرنگترین ئەو میکانیزمانەش:

١. جەختکردنـەوە و سـووربوون لەسـەر مەبەسـتی سـەرەکی و ئامانجی بنەڕەتیی پرۆسـەی پـەروەردە، کە ئەویـش ئامادەکردنـی (مرۆڤی چاک و خێردۆست و مرۆڤدۆست) و (کۆمەڵگەیەکی ئـارام و ئاسـوودە و بۆخواسـوڵحاو) و (مسـۆگەرکردن و بەدیهێنانـی ماناکانی بەندایەتیی ڕاستەقینە بۆ خوای تـاک وتەنهـا). (الحازمـی، سـەرچاوەی پێشـوو: ٣٦٣_ ٣٦٤).

٢. گەشەپێدانی سەلیقە و کارامەییەکانی (بیرکردنەوەی داهێنەر و بونیادنەر) لە ڕێی ئەو بابەتە مەعریفییانەی کە ئاستی تێڕوانین و تێڕامان و درککردن و توانای بەئاگابوون لە زانست و زانیارییە کۆنەکان و تێگەشتنە نوێیەکان پەرە پێ دەدات و لینکی پەیوەندی لەنێوان کۆن و نوێدا دروست دەکات، بەو شێوەیەی لە خزمەت تاک و کۆمەڵدا بێت.

٣. بەهێزکردن و چەسپاندنی تێڕوانینێکی ئیسلامییانە بۆ بابەتەکانی پەیوەندیی هەردوو ڕەگەز، پەروەردەی سێکسی، ئادابە گشتییەکانی کۆمەڵگە، زیان و مەترسییەکانی لادانی کۆمەڵایەتی و ڕەفتاری.

٤. کارکردن بۆ بەهێزکردن و توندوتۆڵکردنی پەیوەندیی نێوان خێزان و ناوەندەکانی پەروەردە و فێرکردن، بە شێوەیەک کە هەریەکەیان (خێزان و ناوەندەکانی پەروەردە و فێرکردن) ببێتە درێژەپێدەری ئەوی تر، لە پەروەردە و پێگەیاندنێکی هاوسەنگ و ڕەخساندنی ژینگەیەکی ئارام، بۆ زیاتر بەئاگابوون و ئاگاداربوون لە هەڵسوکەوتەکانی هەرزەکاران و نەوجەوانان بەگشتی و بەدواداچوون و چارەسەری گرفتەکانیان بەتایبەتی و پاراستنی دەروونددروستیی هەرزەکاران و نەوجەوانان، بەو پێیەی لادانەکان زیاتر لەم قۆناغەدا ڕوو دەدەن. (بڕوانە: الطویل، بلا:١٤_-١٦. عبدالله و علی، ٢٠٠٢: ١٩. الحازمی: ٣٦٣_٣٦٤)

• دەزگاكانی ڕاگەیاندن (میدیا): ڕۆڵ و كاریگەرییەكانی دەزگاكانی ڕاگەیاندن لە بەدەستهێنانی چەندین ئەرك و دەستكەوتی پەروەردەیی شتێكی بەڵگەنەویست و حاشاهەڵنەگرە، چوونكە لە ڕێی ئەم دەزگایانەوە (بینراو، بیستراو، خوێنراو) كارلێككردنی مەعریفی و بەهایی و ڕەفتاری لەسەر وەرگر دروست دەبێت، هەروەها لەم ڕێگەیەشەوە پرۆسەكانی ئاڕاستەكردن و پەروەردە و پێگەیاندن، هۆشیاركردنەوە و ڕۆشنبیركردن دروست دەبێت و پاڵ بە وەرگرەوە دەنێن بۆ چۆنێتیی ڕەفتاركردن لە كۆمەڵگە.

گرنگی ڕۆڵی میدیا لە ڕووبەڕووبوونەوەی گێچەڵی سێكسی لەم خاڵانەدا كۆ دەكەینەوە:

١. ڕێنماییكردن و ئاڕاستەكردنی هەرزەكاران و نەوجەوانان بۆ دەربازبوون لە هەموو جۆرە بیركردنەوەیەكی ناتەندروست و زیانبەخش و ڕاستكردنەوەی ئەو چەمكانەی پەیوەندییان هەیە بە جیاكاریی ڕەگەزی و هەژموونی نێرینەیی و ئەوەی پێی دەوترێ (پیاوسالاری)یەوە!

٢. بونیادنانەوەی كەسایەتیی كەسی گێچەڵكار، لە ڕێی پێشكەشكردنی بەرنامەی كاریگەر، وۆركشۆپ، كۆڕ و سیمیناری جیاجیا، لەلایەن كەسانی پسپۆڕ وخاوەن ئەزموونەوە. لە ڕێی میدیا و میدیای جەماوەری (سۆشیال میدیا).

٣. ڕووماڵكردنی كێشەكانی كۆمەڵگە و دەستنیشانكردنی فاكتەرەكانی لادانە كۆمەڵایەتییەكان و خستنەڕووی میكانیزمە پارێزگاری و چارەسەرییەكان.

٤. پەرەپێدانی دەزگاكانی ڕاگەیاندن تا بە ئەركی خۆیان هەستن لە ڕووبەڕووبوونەوەی تاوانكاری و لادان.

٥. ڕێگری لە بڵاوکرنەوەی هەر بابەتێک کە ڕێخۆشکەر بێت بۆ ئەنجامدانی تاوانکاری، لەناویشیاندا تاوانی گێچەڵی سێکسی. هەروەها ڕێگری و قەدەغەکردنی هەر بابەتیک ببێتە ورووژاندنی سێکس.
٦. هەبوونی (ڕاوێژکاری پەروەردەیی و دەروونی) لە دەزگاکانی ڕاگەیاندن و میدیا و سۆشیال میدیا.

- **ئاسایشی تەکنۆلۆژیا و تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان:** چوونکە ئەگەر تەکنۆلۆژیا (تەوزیف) نەکەین و ئاسایشی تۆڕەکان مسۆگەر نەبێت، ئەوا لایەنە باشەکانی لێ بەرهەم نایەت، بەلام بە تەوزیفکردنی تەکنۆلۆژیا و سنووربەندی، دەتوانین ڕێ لە چەندین لادانی کۆمەڵایەتی و خێزانی بگرین، لەناویشیاندا گێچەڵی سێکسی. (بڕوانە: عەلیرەزا گەنجی و پیتەر فیلیمینیگ: ١١ بۆ دواوە. خالد بن عبدالرحمن القريشي: ١٠٦-١٠٩).

**سێیەم - سەرقاڵکردنی لاوان و چارەسەری کێشە کۆمەڵایەتی و ئابوورییەکان:**

لەبەر ئەوەی دۆزینەوەی هەلی کار و سەرقاڵکردن و بەرهەمهێنانی سەلیقە و کارامەییەکانی کەسی گێچەڵکار و باشبەکارهێنانی توانستەکانی، بوار دەڕەخسێنێت تا بیر لە هیچ چەشنە هەنگاوێکی نادروست بکاتەوە. بە پێچەوانەوە، سەرگەرمی چەندین چالاکیی ئایینی، هونەری، ڕۆشنبیری، وەرزشی، کۆمەڵایەتی بکرێت، چ لە ناوەندەکانی تایبەت بە لاوان، یان ئەو ناوەندانەی کە کاری چاکسازیی لادەر و تاوانکاران لەئەستۆ دەگرن. (درويش، بلا: ١١٦).

**چــوارەم - گرتنەبــەری ســزا تەمبێیــەكان كــە لــە شــەرعدا بــە** (تعازيـر) ناسـراون، بەرامبـەر كەسـی گێچەڵكار. (علـی، چاوپێكەوتـن: ٢٠١٩/٢/٢٥).

**پێنجــەم - گرنگیــدان بــە ڕێنمایــی پەروەردەیــی و دەروونــی،** هەروەهـا كاركـردن بـۆ گێڕانـەوەی دەروونـدروسـتی و هاوسـەنگی و گونجانـی دەروونـی و كۆمەڵایەتـی بـۆ كەسـی گێچەڵـكار. چوونكـە بەپێی توێژینـەوە سایكۆلۆژییەكان -هـەر وەك دكتـۆر (ئەحمـد هارون) ڕاوێـژكاری چارەسـەری دەروونـی و چارەسـەری ئالوودەبـوون ئاشـكرای دەكات- گێچەڵـی سێكسـی لـە ڕیزبەندیـی نەخۆشـییە دەروونییـەكان هەژمـار كـراوە. (https://www.youm7.com/story/2014/6/16/%D9%85%D8%B3%D8).

**شەشــەم - ئەلتەرناتیڤـی گروپــی هاوڕێیــان:** بەپێی توێژینەوەیـەك كـە (گروپـی كارگێڕیـی توێژینـەوە كۆمەڵایەتـی و تاوانكارییەكانـی ئەنجومەنـی وەزیرانـی كۆیتـی) ئەنجامـی داوە، ٢٦٪ی پاڵنەرەكانـی لادانـی هــەرزەكاران و نەوجەوانــان، هاوڕێــی خراپــە. ٥٩٪ی دەستبەسـەركراوانیش لـە زیندانـی نەوجەوانـان ڕایـان گەیانـدووە، لەژێـر كاریگەریـی هاوڕێكانیـان ڕێـگای لادانیـان گرتووەتـە بـەر، ٥٧٪یـش ڕایـان گەیانـدووە كـە وەك گـروپ لەگـەڵ هاوتەمەنەكانیـان كاری لادەرانەیـان ئەنجـام داوە. (ادارة البحـوث الاجتماعيـة والجنائيـة لمجلـس الـوزراء الكويتـی، بـلا: ٢٧).

لێرەوە پێویسـتە بـۆ ڕێگـری و چارەسـەری لادانـە سێكسـییەكان، بەتایبـەت گێچەڵـی سێكسـی، پەنـا بـۆ (ئەلتەرناتیڤی گروپـی هاوڕێیـان)

بەرین، کە جێگرەوە و ئەلتەرناتیڤی گروپ و هاوڕێ تێکدەر و کەتنچییەکانن.

**حەوتەم - توندتۆڵکردنەوەی ڕێکارە ئیسلامییەکان لە شوێنی کار و ناوەندەکانی خوێندن و شوێنە گشتییەکان**، بەتایبەت پابەندبوونی ڕەگەزی مێ بە پۆشاکی ئیسلامی و ڕێسا و پرنسیپە شەرعییەکانی خۆڕازاندنەوە و کاتەکانی دەرچوون لە ماڵ و کارکردن. بە بۆچوونی هەندێ لە توێژەرانیش، ڕەگەزی مێ نەک تەنها هۆکارێکە بۆ گێچەڵی سێکسی، بەڵکوو دروستکەری گێچەڵی سێکسییە بە هۆی پابەندنەبوون بە پۆشاکی ئیسلامییەوە و ڕەچاونەکردنی مەرجە شەرعییەکانی دەرچوون لە ماڵ، لەوانەش جوانکاریی لەڕادەبەدەر و جلوبەرگی تەسک و تەنک و ناشەرعی. (قهوجی، ٢٠١٠: ٤٣). لە توێژینەوەیەکی (سەنتەری میسری بۆ مافەکانی مرۆڤ) کە سەبارەت بە گێچەڵی سێکسی ئەنجامی داوە، ٦١٪ی بەشداربووان ئاشکرایان کردووە کە یەکێک لە هۆکارەکانی گێچەڵی سێکسی شێوازی جلوبەرگ و خۆڕازاندنەوەی لەڕادەبەدەری ئافرەتانە. (فاید وزکی، سەرچاوەی پێشوو: ٢٢، حسن، بلا: ٩).

ئەگەرچی باڵاپۆشی فەرزێکە لە فەرزەکانی ئیسلام و ڕێوشوێن و مەرجی خۆی هەیە، بەڵام ئەوەی جێی سەرنج و تێڕامانە، ڕێژەیەکی زۆر لەو پۆشاکانەی ژنان و کچانی باڵاپۆش دەیپۆشن، مەرجە شەرعییەکانی تیادا نییە، ئەمە لە لایەک، لە لایەکی ترەوە زیادەڕەوی نییە گەر بڵێین هەندێ لەو باڵاپۆشانە سەرنجڕاکێشترن لەوانەی کە باڵاپۆش نین، ئەمەش بە هۆی جۆری ئەو جلوبەرگانەی باڵاپۆشەکان دەیپۆشن، بێ گوێدانە شەرعیبوون یان ناشەعیبوونی ئەو پۆشاکانە!

**هەشتەم - گەشەپێدانی توانست و کارامییەکانی ڕەگەزی مێ؛ هۆشیاری و مەعریفی، ژیری و سۆزداری، یاسایی و کۆمەڵایەتی، متمانەیی**

ئەمانەش بۆ ئەوەیە تا ڕەگەزی مێ، بێدەنگ نەبن لەئاست ئەم جۆرە ڕەفتارە لادەر و کەتنکاریانەی کە بەرامبەریان دەکرێت، لەناویشیاندا گێچەڵی سێکسی، چوونکە ئەنجامی توێژینەوە مەیدانییەکان ئەوەیان سەلماندووە کە یەکێک لە پاڵنەرە بنەڕەتی و کاریگەرەکانی گێچەڵی سێکسی، بێمتمانەیی و بێدەنگبوونی قوربانییەکانە -ئافرەتانی گێچەڵپێکراو- ئەمە لە لایەک، لە لایەکی ترەوە، توێژینەوە مەیدانییەکان کاریگەری و ڕۆڵی ئەم جۆرە گەشەپێدانەیان سەلماندووە بۆ ڕووبەڕووبوونەوە و کەمکردنەوەی حاڵەتەکانی گێچەڵی سێکسی و دەرهاویشتەکانی لەسەر باری دەروونیی گێچەڵپێکراو. (الفار، ٢٠١٧: ٧٣٢_ ٧٣٣؛Morgan,1999: 70_71).



## وتەی کۆتایی

لەم کتێبەدا نووسەر وەک توێژەرێکی بواری پەروەردەیی و دەروونی هەوڵی داوە -پشتئەستوور بە چاوپێکەوتنی خەڵکانی پسۆڕ و دەیان توێژینەوەی مەیدانی- شیکارێکی زانستی بۆ گێچەڵی سێکسی و پاڵنەرەکان و دەرهاویشتەکانی بکات، لە کۆتاییشدا گەشتووەتە ئەم دەرەنجامانە:

١. وەک ڕوویەکی لادانی ڕەفتاری، گێچەڵی سێکسی ڕوو دەدات لە دەرەنجامی کۆمەڵێک پاڵنەری پەروەردەیی، ئاکاری، کۆمەڵایەتی، ئابووری، هتد... لەپێش هەموو هۆکارەکانیشەوە: نەبوونی پەروەردەی ئیسلامی و تێڕوانینی ئیسلامیی دروست لای تاکەکان بۆ سێکس.

٢. ناوەندە پەروەردەییەکانی وەک مزگەوت، خێزان، ناوەندەکانی خوێندن، میدیا، ئەمانە کاریگەریی ڕاستەوخۆیان هەیە لە ڕووبەڕووبوونەوەی گێچەڵی سێکسی و کەمکردنەوەی لێکەوتەکانی.

٣. پابەندنەبوون بە سنوورە شەرعییەکانەوە هۆکاری سەرەکیی گێچەڵی سێکسییە.

٤. وێناکردنی ئافرەت وەک شمەک و بابەتێکی ڕیکلامیی میدیایی ڕۆڵی نەرێنی دەبینێت لە لادانە کۆمەڵایەتییەکان، بەتایبەت گێچەڵی سێکسی.

٥. نەبوونی هۆشیاریی سێکسی و (پەروەردەی سێکسیی تەندروست) لای خەڵکی بەگشتی و نەوجەوانان بەتایبەتی، هۆکار و هاوکارە بۆ لادان و گێچەڵی سێکسی.

٦. هەندێ جار ڕەگەزی مێ بەرپرسیارە لە گێچەڵی سێکسی بە هەرسێ پۆلێنەکەی (زارەکی، نازارەکی، سێکسی)، بەتایبەت لە خۆڕازاندنەوەی لەڕادەبەدەر، هەروەها بێدەنگیی ڕەگەزی مێ لە ئاست گێچەڵکار.

٧. گێچەڵی سێکسی هۆکارە بۆ لەدەستدانی دەروونتدروستیی گێچەڵکار و گێچەڵپێکراو، هەروەها سەرهەڵدانی دڵەڕاوکێ و لەدەستدانی متمانەبەخۆبوون لای ڕەگەزی مێ. هەروەها کاریگەریی دەبێت لەسەر ئاشتی و ئاساییشی کۆمەڵایەتی.

٨. نەبوونی سزای کاریگەر بۆ کەتنکاران و ئەنجامدەرانی گێچەڵی سێکسی، ڕێ خۆش دەکات بۆ زیادبوونی ئەم ڕەفتارە و تێکدانی تەونی کۆمەڵایەتی و ئاشتیی کۆمەڵایەتی.

نووسەر بە پێویستی دەزانێت ئەم چەند پێشنیاز و ڕاسپاردەیە بخاتە ڕوو، بەو هیوایەی بە هەموومانەوە ببینە کۆڵەکەی بەها ڕەسەنەکانی میللەتەکەمان و پارێزەری ئاکار و ڕەوشتی تاکەکانی کۆمەڵگە، بەتایبەت ڕەگەزی مێ.

١) ئەنجامدانی توێژینەوە و لێکۆڵینەوەی زیاتر سەبارەت بە سێکس و بابەتە پەیوەندیدارەکانی و خستنەڕووی ڕای ئیسلام سەبارەت بە سێکس، هەروەها ئەنجامدانی توێژینەوە و لێکۆڵینەوەی زیاتر سەبارەت بە لادانە سێکسییەکان و دەرەنجامەکانیان لەسەر تاک و خێزان و کۆمەڵگە.

٢) سازدانی سیمینار و وۆرکشۆپ بۆ ڕەگەزی مێ، بەتایبەت خوێندکارانی ئامادەیی و زانکۆ و پەیمانگاکان، سەبارەت بە

مافەکانیـان و چۆنێتیـی بڕوابەخۆبـوون و بەرگریلەخۆکـردن و مامەڵـەی دروسـت لەگـەڵ گیچڵـکاری سێکسـی.

٣) توندوتۆڵکردنی پەیوەندیی نێوان دەزگا پەروەردەییـەکان و خێزان، زەروورەتـی بوونـی تێگەیشـتنی هاوبـەش بـۆ چۆنێتیی مامەڵکـردن لەگەڵ قۆناغی هـەرزەکاری و ئاڵۆزییەکانی.

٤) زیادکردنـی بابەتەکانـی پـەروەردە و هۆشـیاریی سێکسـی لـە پرۆگرامەکانـی خوێنـدن، بـەو شـێوەیەی لەگـەڵ تەمەنـی خوێنـدکار بگونجێـت و خزمـەت بـەو چینـە بـکات.

٥) چڕکردنـەوەی هەڵمەتی هۆشیاریی حکومی و ناحکومی دەربارەی مەترسییەکانی لادانە کۆمەڵایەتییـەکان و لادانی سێکسی و گێچەڵی سێکسی.

٦) کردنـــەوەی (ســـەنتەرەکانی ڕاوێـــژکاری و ڕێنمایـــی خێزانـــی) و سەرپەرشـتیکردنیان لەلایـەن کەسـانی پسـپۆڕەوە، بە مەبەسـتی پێدانـی هۆشـیاری و ڕێنمایـی گونجـاو سـەبارەت بـە دیـاردە کۆمەڵایەتییـەکان و زەبتوڕەبتـی کۆمەڵایەتـی.

# سەرچاوەکان

**یەکەم - قورئانی پیرۆز.**

**دووەم - سەرچاوە عەرەبییەکان:**


ابن الأثير، مجد الدين أبو السعادات، النهاية في غريب الحديث والأثر، تحقيق: طاهر أحمد الزاوى - محمود محمد الطناحي، المكتبة العلمية - بيروت، ١٣٩٩هـ - ١٩٧٩م.

ابن منظور محمد بن مكرم، لسان العرب، دار صادر- بيروت، بلا.

الأزهري، أبو منصور محمد بن أحمد. تهذيب اللغة، تحقيق: محمد عوض مرعب، دار إحياء التراث العربي – بيروت، ٢٠٠١.

جابر، عبد الحميد جابر و علاء الدين كفافي، معجم علم النفس والطب النفسي، دار النهضة العربية- القاهرة، ط١، ١٩٩٢.

جمعة، اسعد احمد وعارف أسعد جمعة، دراسات فى علم الاجتماع الاسلامى، دار العصماء- دمشق،ط١- ١٤٣٠هـ- ٢٠١١ م.

الحازمى، خالد بن حامد، أصول التربية الإسلامية، دار عالم الكتب – المدينة المنورة، ط١، ١٤٢٠هـ - ٢٠٠٠م.

الحفنى، عبدالمنعم، الموسوعة النفسية الجنسية، مكتبة مدبولى – القاهرة – ط، ٢٠٠٢.

حسـن، رشـا محمـد , غيـوم في سـماء مـصر : التحـرش الجنـسي مـن المعاكسـات الكلاميـة حتـي الاغتصـاب، دراسـة سوسـيولوجية : اشراف: نيـاد أبـو القمصـان ,مراجعـة: الدكتـورة عميـاء شـكري , مـن منشـورات المركـز المـصري لحقـوق الإنسـان ,بـدون سـنة نـشر.

سـليم، سـلوى علـى، الاسـلام والضبـط الاجتماعـى، مكتبـة وهبـة – القاهـرة، ١٩٨٥.

الشـنقيطى، محمـد ساداتى، الإعـلام الإسـلامي ـ المنهـج، الريـاض، دار عـالم الكتـب١٩٩٨.

طالـب، أحسـن محمـد، دور الاسرة في حمايـة أبنائهـا مـن الانحـراف الفكـرى، جامعـة نايـف العربيـة للعلـوم الامنيـة، ٢٠٠٥.

الطويـل، لميـاء سـليمان مسـؤولية المؤسسـات الدعويـة فـى عـلاج ظاهـرة التكفيـر، جامعـة الإمـام محمـد بـن سـعود الاسـلامية، بـلا.

الفـرع الوطنـي لمنظمـة الشـفافية الدوليـة، مركـز المنـاصرة والإرشـاد القانـوني، التحـرش الجنـسي في أماكـن العمـل كشـكل مـن أشـكال الفسـاد , فلسـطين , تشريـن أول ٢٠١٠

الغـزالي، محمـد بـن محمـد أبـو حامـد، إحيـاء علـوم الديـن، دار االمعرفـة- بيـروت، بـلا.

فـرج هشـام عبدالحميـد، التحـرش الجنـسي وجرائـم العـرض، مطابـع دار الوثائـق, ٢٠١١.

الفرمـاوي، حمـدي علـى، نظريـة الركائـز الأربعـة للبنـاء النفـسي، دار صفـاء، عـمان، ط١، ١٤٣٠هـ- ٢٠٠٩م.

الفيومـي، أحمـد بـن محمـد بـن علـي المقـري، المصبـاح المنـير، المكتبـة العلميـة _ بـيروت، بـلا.

قطـب، محمـد، منهـج التربيـة الإسـلامية، دار الكتـاب الإسـلامى، قـم – إيـران، ط٣، د ت.

قهوجـى، ايلـى ميشـال، الجرائـم الاخلاقيـة_ مطبعـه زيـن الحقوقيـة_ ط٢٠١٠،١ .

عبيـدات وآخـرون، محمـد، منهجيـة البحـث العلمـى_ القواعـد والمراحـل والتطبيقـات _ دار وائـل، بيـروت، ١٩٩٩.

الطويـل، عثـمان: التربيـة الجنسـية في الإسـلام للفتيـات والفتيـان، تقديـم الداعيـة إبراهيـم عرعـراوي، دار الفرقـان.

لطفـى الشربينـى، معجـم مصطلحـات الطـب النفسـى، مؤسسـة الكويـت للتقـدم العلمـى- الكويـت- بـلا.

مصطفى وآخرون، إالمعجم الوسيط: دار الدعوة – بلا.

مـوسى و زيـن العايـش، رشـاد عـلي عبدالعزيـز و زينـب بنـت محمـد، سـيكولوجية العنـف ضـد الاطفـال، عـالم الكـت، ط١. ١٤٢٩هـ

الهـروي، محمـد بـن أحمـد، تهذيـب اللغـة، تحقيـق: محمـد عـوض مرعـب، دار إحيـاء الـتراث العـربي – بـيروت، ط١، ٢٠٠١م.

النـووي أبـو زكريـا محيـي الديـن يحيـى بـن شرف، روضـة الطالبـين وعمـدة المفتـين،

تحقيـق: زهـير الشـاويش، المكتـب الإسـلامي، بـيروت- دمشـق- عـمان، ط٣، ١٤١٢هـ / ١٩٩١م.

**سێیەم - سەرچاوە كوردییەكان:**

فاضل نظام الدين، فەرهەنگی شيرين، سلێمانی، چ٣،٢٠٠٣.

كاكەمحمود، أحمد، تەفسيری ڕامان.

عبدالحميد، نيزامەدين، تەفسيری گوڵشەن، تاران،٢٠٠٧.

امين، بورهان محمد، تەفسيری ئاسان، چاپی سێیەم، بێ ساڵی چاپ.

**چوارەم - نامەكانی دكتۆرا و ماستەر:**

أحمد، أمل محمد، مفهوم الأمن الفكری وتطبيقاته التربوية – رسالة ماجستير غير منشورة –،جامعة أم القری – كلية التربية، مكة المكرمة، ١٤٢٧هـ.

دحمانی ايمان و بلحاجی محمد، أثر التحرش الجنسي بالمرأة العاملة على إستقرارها الوظيفي – رسالة ماجستير، جامعة الطاهر مولای، كلية العلوم الاجتماعية والانسانية- ٢٠١٧.

سليم، أسامه رافت، عوامل التحرش الجنسي بين الطلاب في المرحلة الإبتدائية ,

رسالة ماجستير، جامعة الإمام محمد سعود، كلية الخدمة الاجتماعية، بدون سنة

العمري، أحمد درويش، وسائل التربية الاسلامية فی استغلال وقت فراغ الشباب، رسالة ماجستير، جامعة أم القری_ كلية التربية، ١٤١٢.

مصطفی، لقاط، جريمة التّحرش الجنسی فی القانون الجزائری والقانون المقارن، رسالة الماجستير، جامعة الجزائر- كلية بنعكنون،٢٠١٢-٢٠١٣.

وئام و أسماء، طوابلة وماجد، التحرش الجنسى عبر الانترنيت – رسالة ماجستير- الجامعة الجزايرية، ١٤١٥هـ

فؤاد بن عبدالكريم بن عبدالعزيز العبدالكريم، قضايا المرأة فى المؤتمرات الدولية، رسالة دكتوراه غير منشورة، جامعة الإمام محمد بن سعود الإسلامية – كلية الشريعة، ١٤٢٠هـ- ٢٠٠٠م،.

عبدالمنعم، عبدالعزيز بن سعدون، أحكام التحرش الجنسى – رسالة ماجستير - جامعة الإمام محمد بن سعود الإسلامية - المعهد العالي للقضاء،١٤٣٢-١٤٣٣ هـ

### پێنجەم - توێژینەوەکان و لێکۆڵینەوەکان:

أعراب، محمد، التحرش الجنسى من الطابوهات المسكوت عنها الى التجريم القانونى- مجلة العلوم الاجتماعية –الجزائر،ع ٢٠٠٩/٨.

إيمان، دحمانى، أثر التحرش الجنسي بالمرأة العاملة على إستقرارها الوظيفي جامعة، الطاهر مولاي سعيدة، كلية العلوم الاجتماعية والإنسانية، قسم العلوم الإجتماعية،الجزائر ٢٠١٦.

دراسة حالة المجتمع المصرى- جامعة القاهرة- كلية الاقتصاد والعلوم السياسية، ٢٠٠٩.

دراسة ميدانية بمحافظة سوهاج، كلية الاداب، جامعة سوهاج،٢٠١٥.

عاشور، احمد محمد عبداللطيف و اخرون، التحرش الجنسى،اسبابه، تداعياته، أليات المو اجهة، دراسة حالة المجتمع المصرى. جامعة القاهرة_ كلية الاقتصاد والعلوم السياسية_ ٢٠٠٩.

عبادة، مديحه احمد، الابعاد الاجتماعية للتحرش الجنسي فى الحياة اليومية – دراسه ميدانية بمحافظة سوهاج، بلا.

عبدالحليم محى الدين، الدراما التلفزيونية والشباب الجامعى – دراسة ميدانية- مصر – دار الفكر، ١٤٠٤هـ - ١٩٨٤

عبدالصمد، محمد، ظواهر الانحراف الاجتماعي في المجتمع الإسلامي ومعالجتها، مجلة الجامعة الاسلامية العالمية –شيتاغونغ، المجلد الرابع، ديسمبر ٢٠٠٧ م.

الفار، ساندى سمير ابراهيم، فعالية برنامج معرفى سلوكى لزياده الثقة بالنفس لضحايا التحرش الجنسى من طالبات الجامعة، مجلة كلية التربية _ جامعة بورسعيد، العدد الواحد والعشرون، يناير ٢٠١٧.

فايد و زكى، سوسن، وليد رشاد، التحرش الجنسي في المجتمع المصري دراسة ميدانية على عينة من الفتيات المتحرش بهن – رابطة المرأه العربية – القاهرة،٢٠١٥.

**شەشەم - چاوپێکەوتنەکان:**

چاوپێکەوتنی نوسەر لەگەڵ پرۆفیسۆر : د.کەریم شەریف قەرەچەتانی، مامۆستای زانکۆ و پسپۆڕی دەروونی لە ٢٠١٩/٣/١٥.

چاوپێکەوتنی نوسەر لەگەڵ پرۆفیسۆری یاریدەدەر: د.عالیە فەرەج _ مامۆستای زانکۆ و پسپۆڕی کۆمەڵناسی لە ٢٠١٩/٣/١.

چاوپێکەوتنی نوسەر لەگەڵ مافناس : بەختیار محمد علی_ سەرۆکی فەرمانگەی داواکاری گشتی هەڵەبجە، لە ٢٠١٩/٢/٢٥.

**حەوتەم - سەرچاوە بیانییەکان:**

Phoebe A. Morgan, Risking Relation Ships : Understanding the Litigation Choices of

Sexually Harassed Women, Law & Society Review, Vol. 33, No. 1, 1999, pp. 70-71.

Laura A. Reese and Karen E. Lindenberg Gender, Age, and Sexual Harassment Review of Public Personnel Administration.2005,

Asyan Sever, Mainstream Neglect of Sexual Harassment as A Social Problem, Op.cit.,.

Marisela Huerta and others , Sex and Power in the Academy: Modeling Sexual Harassment in the Lives of College Women, Pers Soc Psychol Bull

Asyan Sever, Mainstream Neglect of Sexual Harassment as A Social Problem, Op.cit.

Vincent N. Parrillo, Contemporary Social Problems, Allyn and Bacon, Boston, 2002, p.

**هەشتەم - ئینتەرنێت:**

**سایتی الیوم السابع:**

https://www.youm7.com/story/2014/6/16/%D9%85%D8%B3%D8

**خەندان:**

http://www.xendan.org/detailnews.aspx?jimare=39340&babet=1&relat=1024

**رێکخراوی فریاکەوتنی میللی:**

http://pao-iraq.org/ar/index.php/kurdish

**سایتی کەی ئین ئین:**

http://www.knnc.net/Drejey-hawal.aspx

## بەرهەمەکانی نوسەر

**یەکەم - کتێب:**

١. تێڕوانینێکی شەرعی بۆ یارییە وەرزشییەکان (١٩٩٦).

٢. ئاساییشی هزری لە ڕوانگەی ئیسلامەوە (٢٠١٨).

٣. دەربارەی پەروەردە و سایکۆلۆژیی ئیسلامی (٢٠٢٠).

٤. (گێچەڵی سێکسی) ئەم کتێبەی ئێستا لە بەردەستتدایە.

**دووەم - توێژینەوەکان:**

١. الارهاب من منظور اسلامي، گۆڤاری زانکۆی سلێمانی / B، ژمارە (٤٨) ساڵی ٢٠١٥.

٢. ضبط الانفعالات من منظور اسلامي، گۆڤاری زانکۆی ڕاپەڕین، ژمارە (٧) ٢٠١٦.

٣. الدوافع الانسانية وضبطها في المنهج الاسلامي، گۆڤاری زانکۆی گەرمیان، ژمارە (٩) ساڵی ٢٠١٦.

٤. الصحة النفسية لدى عينة من ضحايا القصف الكيمياوي في محافظة حلبجة في العراق، گۆڤاری (الادب والفنون وعلوم الانسانيات والاجتماع- ئیماراتی عەرەبی یەکگرتوو) ژمارە (١٤) ٢٠١٧.

٥. الصحة النفسية لدى عينة من المطلقات في محافظة حلبجة العراقية، گۆڤاری (الادب والفنون وعلوم الانسانيات والاجتماع- ئیماراتی عەرەبی یەکگرتوو) ژمارە (٢٤) ٢٠١٨.

٦. التفكير الابداعي من منظور إسلامي، وتطبيقاته لدى عضو هيئة التدريس الجامعي (طرائق التدريس أنموذجا) گۆڤاری زانکۆی، ژمارە (١٦) سلێمانی – ٢٠٢١.

لـەم لێکۆڵینەوەیـەدا هەوڵمـان داوە شـیکار و پەسـن (وەسـف) ی گێچەڵـی سێکسـی بکەیـن، بـەو پێیـەی دیاردەیەکی فرەڕەهەنـدە و ڕووبەڕووبوونـەوەی دەبێـت فرەلایـەن بێـت. لـە کۆتاییشـدا کۆمەڵێک پێشنیار و ڕاسپاردە خراونەتە ڕوو، بە مەبەستی ڕووبەڕووبوونـەوەی دیاردەی گێچەڵـی سێکسـی و کەمکردنـەوەی لێکەوتـە و ئاسـەوارەکانی لەسـەر (گێچەڵکار) و (گێچەڵپێکراو) و خێـزان و کۆمەڵگـە و دەزگا و ئۆرگانـەکان.

گرنگـی و بایەخـی ئـەم لێکۆڵینەوەیـە لـەم چەنـد خاڵـەدا خـۆی دەبینێتـەوە:

١. ئـەم لێکۆڵینەوەیـە لەسـەر بابەتێـک دەدوێت، کـە کەمترین بایەخـی پـێ دراوە لـە توێژینـەوە و لێکۆڵینـەوە ئیسـلامییەکاندا، کـە ئەویـش بابەتـی سێکسـی و گێچەڵـی سێکسـییە.

٢. ئـەم لێکۆڵینەوەیـە هـەوڵ دەدات لێکدانەوەیەکـی ئەکادیمییانـە بکات بـۆ گێچەڵـی سێکسـی، لـە ڕێـی ڕاڤـەکاری و لێکدانـەوەی ئایینـی و سۆسـیۆلۆژی و سـایکۆلۆژی و یاسـاییەوە.

٣. لـەم لێکۆڵینەوەیـەدا پشـت بـە توێژینـەوە مەیدانییـەکان و داتـا و ئامـارەکان بەسـتراوە، لـە ئاسـتی ناوخـۆ و دەرەوە.

٤. لـەم لێکۆڵینەوەیـەدا و لـە ڕێـی چاوپێکەوتنـی ڕاسـتەوخۆی توێژەر لەگـەڵ خەڵکانـی پسـپۆڕ، لێکدانـەوە و شـیکاریی زانسـتی بـۆ دیاردەی گێچەڵـی سێکسـی کـراوە، (ماهیەتـی، پاڵنەرەکانـی، لێکەوتەکانـی، سـتراتیژیەتی ڕووبەڕووبوونـەوەی).

٤٠٠٠ دینار
ISBN:978-9922-686-60-8
9 789922 686608

RENWEN

07501269689
07511408868
hakem1423@yahoo.com
renwen2009@yahoo.com
سلێمانی - بازاڕی ئاوباریک- نهۆمی یەکەم
بەرامبەر کاسۆمۆڵ - دوکانی ژمارە (٦٦)